# بەرەو

# دادگەریی کۆمەڵایەتی

**لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتاییە دەربارەی ڕێبازی**

**ئابووریی ئیسلام**

حمه کریم عبدالله

رقم الایداع ۱۱۷ في المكتبة الوطنية ببغداد لسنة ۱۹۸٥

**چاپی یەکەم**

۱٤۰٥ کۆچی ـ ۱۹۸٥ زایینی

---

**مطبعة أسعد/بغداد**

## پێشــکەشە :

- بەوانەی بەدوای ڕاستیو دادگەریدا ئەگەڕێن
- بەوانەی بەتەنگ دوارۆژی هەژارانەوەن
- بە گیانی دایكو باوكم

## بسم الله الرحمن الرحيم

ليس البرّ ان تولوا وجوهكم قبل المشرق والمغرب ولكن البرّ من آمن بالله واليوم الاخـــر والملائكـــة والكتٰب والنبيين واتى المال عــلى حبه ذوى القربــى واليتٰمــى والمســاكين وابن الســبيل والسائلين وفي الرقاب واقام الصلواة واتى الزكــواة والموفــون بعهدهم اذا عاهدوا والصابرين في البأساء والضـراء وحين البأس اولئك الذين صدقوا واولئك هم المتقون ـ البقرة/١٧٧

واتــه : چاكــه ئەوە نییە لەنوێژا ڕووبکـــەنە ڕۆژهەلاّتو ڕۆژئاوا ، بەلکــو چاكــه باوەڕكردنــه بەخواو ڕۆژی زیندووبونەوەو فریشتەكــانو كتێبە نێراوەكانو پێغەمبەرانو ، لەســامانی خۆی بەشی خزمانو هەتیوانو نەدارانو ڕێبوارانو سوالكەران بدات ، وە كۆیلەشی پێ ئازاد بكات ، وەنوێژ بكاتو زەكات بداتو پەیمــان نەشكێنێو ئارام گـــر بێت لەتەنگوچەلەمەو نارەحەتی وە لە گەرمەی جەنگیشا، ئەوانەن ڕاست ئەكەن ، ئەوانــەن كـــەموسلمانی تەواونو گوێ ڕایەلن بۆ فەرمانەكانی خوا ٠

# پێشەکی :

هەزار سڵاو لە گیانی پاکـــی پێشینانی کوردمان کـــە هـــەموو پەندەکانیان وەکو نەخشی بەرد خۆیان ڕاگرتووە بەرامبەر کرێوەو لاسامەو باو بۆرانی ڕۆژگار ، وەکو لەیەکێ لەو پەندانەدا فەرمویانە :

«کەس بەدۆی خۆی نالێ ترشە» ٠

وەکو ئەزانین لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە دوو ڕژێمی گەورە خۆیان سەپاندوە بەسەر جیهاندا ئەوانیش : سەرمایەداریی‌و ، سۆشیالیستی ٠ هەرچەندە دووهەمیان لە ئەنجامێکی سروشتی ئەو بارە نالەبارە پەیدابووە کە یەکەمیان بەدی هێناوە لەژیانی مرۆڤایەتیدا ٠ وە هەریەکەیان خـۆی بەباشترین‌و پێشکەوتووترین‌و دادگەرترین ڕژێم ئەزانێ بۆ ژیان‌و خـۆی بەڕژێمێکی حەتمی دوا ڕۆژی مرۆڤایەتی ئەداتە قەڵەم ، وە هەردوکیان لە هەوڵدانێکی بێ‌وچاندان بۆ ئەوەی بەهـــەر شێوەیەك بۆیان بلوێ خۆیان بسەپێنن بەسەر مرۆڤایەتی‌دا ٠ هەروەها ئەچن بەگژ یەکترداو،هەریەکە هەوڵ ئەدات ئەوی‌تر لەبەرچاوی خەڵکی بخـــات ، بەدەرخستنی لایەنە‌ـ خراپەکانی ، وە هەریەکە ئەوی‌تر بـــە ڕژێمێکی نالەبارو کۆنەپـەرست ئەداتە قەڵەم ، وە بەکۆسپی دائەنێ لەڕێگـــای پێشکەوتندا ٠ تائەوڕادەی دریغی ناکەن لە بەکار هێنانی هێزیش دژی یەکتری ٠

ئەو پرۆپاگەندەو دەهۆڵ لێدانەی بەکاریان هێناوە بۆ ناســـاندنی خۆیان بەخەڵکی تاڕادەیەك توانیویەتی جیهان بکـــات بە دوو بەشەوە ، بەشێك سەر بە سەرمایـــەداری ڕۆژئاواو ، بەشەکـــەی‌تر ســـەر بـــە سوشیالیستی ڕۆژهەڵات ، وە تاڕادەیەك سەرکـەوتنیشیان بـــەدەست هێناوە کە نەهێڵن ڕژێمی سێهەم ــ هەر ڕژێمێك بێت ــ سەر هـــەڵبدات شان‌بەشانی ئەوان ٠ وە بەهەموو شێوەیەك خـــۆیان سەپاندووە بەسەر بیری خەڵکی‌دا لەزۆربەی جیهاندا ، کە بیرنەکەنەوە لە ڕێگەیەکی‌تر بەڵکو ئەبێ شوێن یەکێ لەو دوو ڕژێمە بکەون ٠

بەڵام ئاڵوگۆڕی ڕۆژگارو تاقی‌کردنەوەکـــانی مێژوو دژی ئەوان‌و ڕژێمەکانیان وەستاو ، ئەو ئاڵوگۆڕەی کـــە پەیدابوو لە هەریەکێ لـەو ڕژێمانەدا دەری‌خست باڵورەڵێدانی (حەتمیەتـــی) دواڕۆژ هـــی ئـــەو ڕژێمانەیە ، درۆیەو دوورە لە ڕاســـتی ، وە ئاڵوگۆڕی ناو ڕژێمەکانیان ئەوەی ڕوون‌کردەوە کە کۆمەڵ بوونێکی زیندووەو ، ناتوانرێ بخرێتـــە قاڵبێکی وشکی وەکو بیردۆزەکانی سەرمایەداری‌و مارکسایەتیەوە، بەڵکو لە ڕێگای گەشەکردنی خۆیدا بەرەو مەیدانێکی دژ بەوان ئەڕوات ٠

بێ‌گومان جیهانی ئیسلامیش بێ‌بەش نەبووە لەو هەوڵدانە، بەڵکو ئەم پشکی گەورەتری بەرکـــەوتووە ، ئەویش بەهـــۆی ستراتیژی شوێن‌و جێگاو بوونی بەروبومێکی فراوان تێیدا ، بەتایبەتی (پەترۆڵ) کە ڕۆڵێکی سەرەکی ئەبینێ لە شارستانێتی ئەمڕۆدا ، ئەمە لەلایەك ، وە لەلایەکـــی تریشەوە ئەزانن کە ڕژێمی ئیسلام گەورەترین دوژمنی ئەوانـــەو بەهیچ شێوەیەك ڕێکەوتن نابێت لەگەڵیا ٠

لەبەرئەوە هەردوو ئۆردوگاکە بەوپەڕی توانایانەوە کەوتنە تێکوشان بۆ دەست گرتن بەسەر جیهانی ئیسلامدا ـ شایانی باسە لاوازی جیهانی ئیسلام‌و بچڕبچڕ بوونی‌و نەمـــانی فەرمـــانڕەوایی ئیسلامی ـ بارێکـــی لەباری دروست کردبوو بۆ دەست‌گرتن بەسەر ئەم وڵاتانەدا لەلایەن ئەو دوو ئۆردوگایەوە بەئاسانی ٠ ئەوانیش بەهەموو توانایانەوە کەوتنـــە شێواندنی ڕووی ڕوناکی ڕژێمی ئیسلام،وە تێ‌ئاڵاندنی چەندها بیروڕای درۆو ، پروپاگانتەی ناڕاست بۆ ئەوەی بەتەواوی بتوانن موسڵمانەکـــان دووربخەنەوە لە ئیســـلام بۆ ئاسانی زاڵ بونیان بەسەر میللەتانی ئـــەم وڵاتانەدا ، هەروەکـــو گلادستون سەرەك وەزیرانی ئـــەو سەردەمـــەی ئینگلیزەکان لە کۆبونەوەیەکدا قورئانی پیرۆزی بەرز کردەوەو وتی :تا

ئەم کتێبە لەناو موسڵمانانداا بێت ئێمە ناتوانین جێی خۆمانی تێدا بکەینەوە ، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەبێ هەوڵ بدەن بۆ دوور خستنەوەی موسڵمانەکان لە قورئان ، لێرەدا دواکەوتویی موسڵمانەکانیان کردە بیانویەکی گەورە ، وە وتیان : خەتای ئایینی ئیسلامە ئێوە دواکەوتوونو پێش ناکەون ٠

لە لایەکی ترەوە نەزانییو دواکەوتوویی موسڵمانەکانیش وە نەشارەزاییان لە ئایینەکەیان هۆیەکی گرنگ بوو بۆ باوەڕکردن بەو قسانە ، ئەمەش بووە هۆی بڵاوبونەوەی بیروڕای جیاجیای دژ بە ئیسلام ،وە کەوتنە هەوڵدان بۆ خواستنی ڕژێمو بیروڕای بێگانە لەدەرەوەو پشت گوێ خستنی ڕژێمی ئیسلام ، وەکو ڕژێمێکی کۆمەڵایەتییو ئابوورییو رامیاریی ، بەڵکو وایان لەو خەڵکە ئەگەیاند کە ئیسلام تەنها بریتییە لە نوێژکردنو ڕۆژوو گرتن ، ئیتر هیچ پەیوەندیەکی بە ڕژێمی ئابوورییو کۆمەڵایەتیو ٠٠ هتد ، نییە ٠

لەبەرئەوە قەیناکا ئێوە موسڵمان بنو نوێژو ڕۆژی خۆتان بکەن حەجیش بکەنو مزگەوت دروست بکەنو قورئان بخوێنن ٠٠ بەڵام پێویستە وەکو هەموو وڵاتانی پێشکەوتووی جیهان ئێوەش ڕژێمی ڕامیاریی دیموکراسی لەوان بخوازنو ڕژێمی ئابووریی سەرمایەداریی وسۆشیالیستی لەوان بخوازن جێبەجێیان بکەن لە ژیانتانا ، چونکە ئایینی ئیسلام تەنها پەیوەندییە لە نێوان مرۆڤو خوادا ، نەك ڕژێمێکی کۆمەڵایەتییو ئابوورییو ڕامیاریی تەواوە بۆ جێبەجێ کردن لە ژیانداو ڕەفتار کردن بە پێی دەستورو یاساکانی ٠

بەڵام ڕاستیەکەی ئیسلام تەنها پەیوەندی نێوان مرۆڤو خوای گەورە نییەو بەس ، بەڵکو ئیسلام ڕژێمە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی ، وە هەموو لایەنێکی ژیان ئەگرێتەوە ، هەروەکو پەیوەندی نێوان مرۆڤو خوای گەورەیە ، پەیوەندیشە لە نێوان مرۆڤێكو مرۆڤێکیتر ، وە پەیوەندیشە

لە نێوان مرۆڤ وکۆمەڵ ، وە پەیوەندیشە لە نێوان کۆمەڵێکو کۆمەڵێکی‌تر ، واتە هیچ لایەنێکی ژیان نەماوە ئیسلام لێی نەدوابێ‌و بۆچوونێکی تایبەتی‌و سەربەخۆی نەبێ لەبارەیەوە چ لەکاتی ئاشتی‌و چ لەکاتی جەنگیشدا ٠

تاقی‌کردنەوەکانی مێژووی مرۆڤایەتی ڕوونی کردۆتەوە ئەو دوو ڕژێمە ، کە بەئاگرو ئاسن خۆیان سەپاندووە بەسەر خەڵکیدا ، توانای خۆ ڕاگرتنیان نەماوەو وایان لێهاتووە کەوتوونەتە ئاڵوگۆڕو پینەکردنی کە لێنی ڕژێمەکانیان ، بۆ ئەوەی بتوانن بمێننەوەو لەسەر پێ ڕابووەستن‌و نەکەون ٠

زۆر لە زانایانی جیهان ئەوانەی لە ئیسلام کۆڵیونەتەوە بۆیان ڕوون بۆتەوە ئیسلام تاقە ڕژێمە کە بتوانێ هەموو مرۆڤایەتی ڕازی بکات‌و مافی هەموو کەسێك لە سنورێکی مامناوەندی‌و دادگەردا دیاری بکات ،وە ماوە نەدات هیچ کەس یان هیچ کۆمەڵ‌و میللەتێك مافی کەس‌و کۆمەڵ‌و میللەتانی‌تر بخوات ٠

— بەڵێ ئیسلام ڕژێمێکی ڕامیاریی تایبەتی‌و سەربەخۆیە ، وە هیچ پەیوەندیەکی نەبە دیموکراسی‌و بەرەڵایی ڕۆژئاواوە هەیە ، وە نە بە دکتاتۆریی پرۆلیتاریاو خۆبەسەرا سەپاندنی ڕۆژهەڵاتەوە ٠

— هەروەها ڕژێمێکی ئابووریی سەر بەخۆیەو هیچ پەیوەندیەکی نە بە سەربەستی ئابووریی ڕۆژئاواو، نە بە دەست بەسەراگرتنی هەموو بوارەکانی ژیانی ڕۆژهەڵاتەوە هەیە ٠

— هەروەها ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی سەربەخۆیە و هیچ پەیوەندیەکی بە ڕژێمی کۆمەڵایەتی سەرمایەدرایی‌و مارکسایەتیەوە نییە ٠

لێرەدا من لەم نوسینەدا ئەمەوێ ئەوەندەی لە دەستم هاتووە ، بە پێی توانای خۆم سەرەتایەکی کورتی ڕێبازی ئابووری ئیسلام ڕوون بکەمەوە ، کە تائێستا دوژمنانی ئیسلام ونۆکەرانی بێگانە ، دان بە بوونی ڕێبازی ئابووری لە ئیسلامدا نانێن ، چونکە دڵنیان لەوەی هەرکاتێ ڕژێمی ئیسلام هاتەکایەوە ، وە لە سوچێکی ئەم جیهانەدا جێبەجێ کرا ئەبێتە چرایەك بۆ ڕوناك کردنەوەی شەوە زەنگی ڕێگای مرۆڤایەتیو زۆربەی میللەتانی جیهان چاوی لێ ئەکەنو بەرەو ڕژێمی ئیسلام هەنگاو هەڵئەگرن ، وە دەستەو دایەرەی ڕژێمەکانی‌تر ڕاپێچ ئەکەنو ڕایان ئەماڵن ٠

چونکە بۆیان دەرئەکەوێت کە دادگەرییو بەختیارییو ئاسودەیی تەنها لەژێر سێبەری ئیسلامدا دێتە دی ٠ ئیتر ڕژێمەکانی‌تر لە سەر لێشێوانو ستەمو خۆ بەسەرا سەپاندن بەولاوە هیچیان نەبەخشیوە بە مرۆڤ ٠

ئینجا ئەوەی زۆر هانی دام بۆ ئەم نوسینە ئەوەیە کە دەربارەی ئابووریی ئیسلام تا ئێستا هیچ شتێکی ئەو تۆ بە کوردی ئەنوسراوە کە کەلێنێکی کتێبخانەی کوردی پڕ بکاتەوە ، کە زۆر هەژارە لە باسە ئابووریەکان ، وە پێویستی بە لە خۆبوردنی زۆر ڕۆشنبیری شارەزاو کارامە هەیە ، خۆیان هیلاك بکەنو ئەو کەلێنە پڕبکەنەوە ٠

لە لایەکی تریشەوە لە کوردستانی خۆشماندا لەبەر ئەو هۆیانەی لە پێشەوە باسمان کرد ، بەدەگمەن ڕۆشنبیرانی کورد دان ئەنێن بە بوونی ڕژێمی ئابووری لە ئیسلامدا،چونکە کوردستانیش بێبەش نەبووە لەو هێرشە دژ بە ئیسلامەی کە بێگانەکان کردیانە سەر وڵاتە ئیسلامەکان ٠ وە من بۆیە ئەم دەست پێشخەریەم کرد تا ببێتە هۆیەك

کار له ئابووری ناسانی موسڵمانی کورد بکات بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی ئەو لایەنە گرنگە لە ڕژێمی ئیسلام ، چونکە ناڵێم هەموو شــــتێکم ڕوون کردۆتەوە ، بەڵکو تەنها بزوتنەوەیەکە بۆ خســـتنە سەرپشتی دەرگـــای نوسینی ئابووری ئیسلام بەزمانی کوردی وە سامی ئەوانەی پێ ئەشکێنم کە تائێستا بەخۆیاندا ڕانەپەرموون دەست بدەنە پێنوس بۆ ئەم جـــۆرە بابەتە ٠٠ لەبەر هەر هۆیەك بووبێ ؟!

تەنها مەبەستیشم خزمەتی کوردو ڕژێمی ئیسلامە ، پاداشتیشـــمان لای یەزدانی میهرەبانە ٠

ئەسکەندەریە

١٩٧٩/١/١

# مروڤایەتی بەرەو کوێ ؟

ڕژێمەکانی ئەم سەردەمە هـــەر لـــە سەرمایەداریی ڕۆژئاواوە تا سۆشیالیستی مارکسیی ڕۆژهەڵات،نەیانتوانیوە گیروگرفتی کۆمەڵایەتیو ئابووری مرۆڤایەتی چارەسەر بکەن بە شێوەیەکی ڕیشەییو دادگەرانە ، هەروەهـــا نەیانتوانیوە بەختیـاریيو ئاسوودەیی ببەخشـــن بە مرۆڤ سەرەڕای ئەم هەموو پێشکەوتنەی کـــە زانست لە زۆربەی بوارەکانـی ژیاندا هەنگـــاوی مەزنی بۆ هەڵگـــرتووە . بوارەکـــانی تەکنۆلۆژیاو تەندروستيو ژیری ئەلکترۆنيو ئەتۆمو ئاسمان بڕینو .. هتد ـ کـــە ئێستاش هەر بەردەوامە لەسەر ڕێگای پێشکەوتنی خۆی .

بەڵام ئەوەی کە چاوەڕوان ئەکرێت لەم ڕژێمانە ، ئەوەیـە چـــەند زانست پێش بکەوێت ئەوەندە باری ژیانی مرۆڤ ئاڵۆزتر ئەبێتو،زیاتر ئەچەوسێتەوە(٢) . وە ڕۆژ بە ڕۆژ لە بریتی چارەسەری کێشـــەکـــان بێزارىو وەڕس بوونو نەخۆشی دەرونی (نفسـی)و کوێرەوەرىو ترسو لەرز زیاتر ئەبێت ، وە مرۆڤایەتـــی بەرەو هەرەسی ســـەر لێشێوانو لەناوچوون ئەچێت .

زۆر لە زاناکانی جیهان بە تایبەتی زاناکانی ئەورووپاو ئەمریکـــا هەستیان پێکردووەو هاواریان لێ بەرز بۆتەوە ، کە فریاکەون مرۆڤایەتی لەم تەنگەو چەڵەمەیە ڕزگار بکەن ، ئەویش بـە هێنانەکایـــەی ڕژێمێکی کۆمەڵایەتيو ئابووری دادگەر ، کە بتوانێ خەڵکی ڕزگار بکـــات لـــەو گیروگرفتە ناهەموارانەی سەریان کردۆتە جەرگی مرۆڤ !

---

(٢) مەبەستم ئەوە نییە کە زانست ئەو بارە نالەبارە دروست ئەکات ، بەڵکو ئەو ڕژێمانەی ئێستا هەن ئەوان زانست بەرەو ئەو مەبەستانە ڕائەکێشن .

ئەوەی ڕوونو ئاشکراشه هۆی سەرەکی ئەم هەموو ئەنگوچەڵەمانه ئەوەیە کە ڕژێمەکانی ئـەم سەردەمە (مادی)و بێباوەڕن ، بە یەك چـــاو سەیری مرۆڤ ئەکەن ، یەك لای ئەبینن ، ئەویش لایەنی (مادیەتـــی) ٠ ئیتر ئەوەیان پێشێل کردووەو لەبیرخۆیان بردۆتەوە ، کە مرۆڤ تەنها (مادە) نییەو بەس ، بەڵکو مادەو گیانە ، وە گیان هەڵسوڕێنەرو لایەنـــی سەرەکی مرۆڤە ٠ دکتۆر ئەلکسیس کاریل خاوەنی کتێبی (الانســان ذلك المجهول) لە کتێبەکەیدا ئـــەڵێ : پێویستە ئـــەم شارستانیەتـــە مادیە هەڵبگێڕینەوەو ڕێگایەکی‌تر بگرینەبەر بۆ گەشەکردنو پێشکەوتن ، کـــە لەسەر باوەڕ دامەزرابێت(٣) ٠ هەروەها پزیشكو زانای بەناوبانگـــی فەرەنسایی دکتۆر شفیتزر ئەڵێ : پێویستە ئێمە دان بەوەدا بنێین کـــە (فساد الروح) هۆی سەرەکی ئەم تەنگو چەڵەمەو تێشکانەیە کە توشی مرۆڤایەتی بووە(٤) ٠

وە هەر لەو بارەیەوە کۆلن ولسون ڕەخنەگری بەناوبانگی ئینگلیزی لە کتێبی (اللامنتمی)دا ئەڵێت : (ئەو شارستانیەتەی کە تەنها پشت بـــە زانست ئەبەستێ دوور لە ئایین،شارستانیەکە کە ناتوانێ زۆر بمێنێتەوە ، چونکە ئەو بارو دۆخەی لێی پەیدا ئەبێت ناگونجێت لە گـــەڵ مرۆڤی خاوەن هەستو دوور بیندا ٠ وە هەروەها لە هەمان کتێبا لەسەری ئەڕواو ئەڵێ : مرۆڤی ڕۆژ ئاوایی هەمیشە پشتی بەستووە بە ووزە ژیرییەکـــان «الطاقات العقلیة» ئەمەش هۆی پێشکەوتنی مادیە لە ڕۆژ ئاوادا ، بەڵام لە هەمان کاتا هۆی لەناو چوونو ڕوخانیەتی ، ئەو هێزی گیانیی خۆی ون کردووە ، ئەو هێزە زیندوەی کە هۆی مانەوەی مرۆڤایەتی‌یە ، وە بـــەبێ ئەو هێزە ووشەی پێشکەوتن تەنها گاڵتە پێکردنە ، بەڵکو لە ئوتومبێلێك

---

(٣) الانسان ذلك المجهول /دکتور الکسیس کاریل ترجمة شفیق اسعد فرید/١٩٧٧ ل : ١٢ ٠

(٤) گۆڤاری العربی کوەیتی ژمارە ٢٠٦ لاپەڕە/١٨٨ ٠

ئەچێت کە بەنزینی تێدا نەبێت(٥) ئاشکراو بەڵگە نەویستە سەرچـاوەی هەموو باوەڕێك ئایینە ، کە بتوانێ ڕێگـــای ژیانی مرۆڤ دیاری بکـاتەو بی‌بەستێتەوە بە سەرەتایەکی پیرۆزەوە کە بەختیارو دڵنیای بکات ، بۆیە دکتۆر بریل ئەڵێت : (مرۆڤی ئاییندارو خاوەن باوەڕ هەرگیز تووشــی نەخۆشی (نفسی) نابێت ، وە لە ژیانێکـــی ئارامو دڵنیـادا ئـــەژی(٦)٠ هەروەها فەیلەسوفی گەورە ولیام جیمس ئەڵێ : (گەورەترین چارەسەری سەرسامیو بێزاریی ، باوەڕە)(٧) ـ

ـ الا بذکر الله تطمئن القلوب ـ ٠

ئینجا بەستنەوەی ژیانی مرۆڤو ئامانجەکانی تەنها بە ژیانی مادی ئەم جیهانەوەو ، باوەڕ نەبوونیان بە لێپرسینەوەو جیهـانێکـــیتر ، وە دانانی گەیشتن بە گەورەترین قازانجو سوودی مادی لە خواردنو خەوتنو ڕابواردن ، بە مەبەستی سەرەکی ژیانی مرۆڤ لـــەم جیهانەدا ، ئەمەش مرۆڤی لە قاڵبێکا داڕشتووە کە هیچ ئاواتێکی گیانـــی بەرزی نییە لـــە ژیاندا کە تێکۆشێ بۆی ، وە ڕێبازێکی تایبەتی بۆ بگرێتـــە بەر ، لەبەر ئەوەیە هەرکاتێ گەیشت بە سوودو مەرامە مادیەکانی ئیتر هیچ ئاواتێکی تری نامێنێ کە هەوڵی بۆ بدات لە ژیاندا ٠

نوسەری فەرەنسایی ئەندریە مۆرۆ ئەڵێ : (کاتێ کە مرۆڤ گەیشت بە هەموو ئاواتو ئارەزوەکانی ، وا هەست ئەکات دڵتەنگترین کەسە لـــە جیهاندا ، چونکە ئاواتێکی تری نەماوە هەوڵی بۆ بدات) ئەمەش بۆتە هۆی بێزاریو دڵ ناڕەحەتی مرۆڤو پەیدا بوونی گیروگرفت کـــە هیچ شتێك نییە پەنای بۆ بەرێت بۆ چارەسەر کردنیان ٠ وە لە ئەنجـــامی ئەو بارە

(٥) تهافت العلمانیة/د:عمادالدین خلیل/١٣٩٩ هـ مؤسسة الرســـالة ص١٢٩ ـ ١٣٩ ٠

(٦) الانسان وحقیقته في العالم الاخر/محمد صالح کریم خـــان/١٩٦٥ ص٢١ ٠

(٧) الاسلام والعلم الحدیث/عبدالرزاق نوفل/ص١٣٧ ٠

نالەبارەدایە . هەموو ساڵێك دەیان هەزار كەس بە زۆرداری ئەكوژرێن ، وەكو لە ئەمریكا لە ساڵی ١٩٧٧ی زایینیدا (١٢) هەزار كەس كوژراون[٨].

وە بە دەیان هەزاریش بە دەستی خۆیان ، خۆیان ئەكوژن بۆ ئەوەی رزگاریان ببێت لەو ژیانە نا ئاسوودەییەی كە تێیدا ئەژین ، بۆ نمونە لە ساڵی ١٩٧٦ زایینیدا لە ئەڵمانیای رۆژ ئاوا زیاتر لە (١٤) هەزار كەس لە ئافرەت و لە پیاو خۆیان كوشتووە[٩] . هەروەها لە فەرنسایش هەموو ساڵێ ٧ـ٨ هەزار كەس خۆیان ئەكوژن[١٠] .

بەستنەوەی مرۆڤ بە سوودی تایبەتی خۆیەوە لە سنوری جیهانێكی مادیدا ، وە باوەڕ نەبوون بە دوا رۆژێكی هەمیشەیی ، وای لە لە مرۆڤی ئەم سەردەمە كردووە ، كە لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیدا ئامادەیە (میكیاڤیلیانە) هەرچی رێگا هەیە بیگرێتەبەر بۆ گەیشتن بە ئامانجەكانی ، بەبێ ئەوەی گوێ بداتە رەوایی و ناڕەوایی ئەو رێگایانەی گرتویەتەبەر ، با لەسەر حسابی بەرژەوەندی خەڵكی تریش بێت .

لە ئەنجامی سروشتی ئەو رژێمە دەست كردانە ، بە تایبەتی دوای بەرپا بوونی شۆرشی پیشەسازی لە ئەوروپاو پەیدا بونی ئیمپریالیزم و داگیركردنی وڵاتان بۆ خواردنی بەرو بوومیان و چەوساندنەوەی میللەتان بۆ سوودی خۆیان ، ئەمەش بووە هۆی بەرپا بوونی دوو شەڕی گەورەی جیهانی كە دەیان ملیۆن كەسیان لەناو برد ، وە لە ئەنجامی ئەو جەنگانەشدا دابەش كردنی وڵاتان و میللەتان بە شێوەیەكی ناڕەواو دڕندانە كە مافی دەیان نەتەوە پێشێل كراو ، نەتەوەی سەردا سەپێنرا

---

(٨) رۆژ نامەی (الثورە)ی عێراقی ژمارە ٣٠٦٠ لە بەرواری ١٩٧٨/٧/١٦
(٩) رۆژ نامەی (الجمهوریة)ی عێراقی ژمارة ٣١٨٣ لە بەرواری ١٩٧٨/٢/١ .
(١٠) البدیل نوسینی فەیلەسوفی فەرەنسایی رۆجیە گارودی لاپەرە: ٣١

، کە تا ئێستاش لە زۆر ولاتی جیهاندا چەندەها میللەت بە شێوەیەکی ناڕەوا ئەچەوسێنرێنەوەو . هیچ مافێکی نەتەوایەتیو نیشتمانیان نییە . تەنانەت لە زۆر ولاتا هیچ جۆرە سەربەستیو هەتا مافی ژیانیشیان نییە . بە ئاسودەیی بژین !!.

هەر ئەمەشە هەتا ئێستاش لە سەدەی بیستەمدا ، سەدەی زانستو پێشکەوتن ، لە زۆربەی ولاتاندا شۆرشی نیشتمانیو نەتەوایەتی بەرپا کراوەو ، میللەتە ژێر دەستەکان داوای مافی زەوت کراویان ئەکەن ، بێ گومان بەردەوامیش ئەبن تا ئەگەن بە مافی ڕەوای خۆیان کە خوای گەورە بەخشیویەتی بە هەموو میللەتان بەبێ جیاوازی

**( یاایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی' وجعلناکم شعوباً وقبائل لتعارفوا ان اکرمکم عند الله اتقاکم) الحجرات ١٣ .**

واتە : ئەی کۆمەلی ئادمیزاد ، ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروست کردووە ، وە کردوومانن بە چەند نەتەوەو هۆزێکەوە بۆ ئەوەی یەکتری بناسنو ئاشنای یەکتری بن ، وە بزانن ، کە چاکترینتان لای خوا بەتەقوا ترینتانە (ئەوەی زیاتر گوێ ڕایەڵە بۆ فەرمانەکانی یەزدان) .

هەروەها بلاوبوونەوەی پیاو کوشتنو دزیو جەردەیی لە ولاتە بەناو پێشکەوتووەکاندا ئامانجێکی سروشتی ئەو ڕژێمانەیە کە هەرەشە لە لەناو چوونی خۆیانو پێشکەوتنەکەیانو مرۆڤایەتیش ئەکات.لە سەر ژمێریەکی نەتەوە یەکگرتووکاندا ڕوون کراوەتەوە کە : لە سالی ١٩٧٤ زایینیدا زیانی تاوانو بەدڕەفتاری لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا (٨٩) ملیار دۆلار بووە ، لە کاتێکا لە سالی ١٩٧٠ زایینیدا (٥١) ملیار بووە ، واتە بە زیاتر بوونی لە سەدا ٧٤٫٥ !! وە زۆربەی ئەو زیانە لە ئەنجامی تومار

کردن‌و تلیاك خــواردن‌و مــەی خواردنــەوە بووە کــە (٣٧) ملیاری بەرکەوتووە(١١) ٠

ئەمانەو هەزاران تاوانی‌تر کە هەرەشە لە پاشە ڕۆژی مرۆڤایــەتی ئەکەن وایان لە زانایانی جیهان کردووە ، دەنگی ناڕەزایی بەرز بکەنەوە ، وەکو دکتۆر شفیتزر ئەڵێ : من زۆر ڕەش بینم لەو هەڵوێستەی ئێســـتا مرۆڤایەتی تێدا ئەژی ، وە خۆی تێدا ئەبینێ ، هــەرگیز ناتوانم بڵێم ئەو هەڵوێستە ئەوەندە خراپ‌و نالەبار نییە ـ ئەگەر بەم شێوەیە بمێنێتەوە ـ کە بەتەواویی وە بە هەموو ژیری خۆم وا هەست ئەکەم بەرەو چەرخێکی وەکو سەدەکانی ناوە ڕاستمان ئەبات لە شێوەیەکــی نوێدا ٠ بەڵام من دڵنیام بەم شێوەیە نامێنێتەوە(١٢) ٠

چونکە ئەم شارستانیەتەی ئێستا ناگونجێ لە گەڵ مرۆڤ‌و ژیانــی مرۆڤایەتی‌دا ، وە هەڵوێستێکی وای هەیە کــە ڕێك ناکەوێت لە گــەڵ سروشت‌و فیطرەی مرۆڤــدا ، وە هــەمووی لە ئەندێشــەی بیردۆزە زانستیەکان‌و ئارەزوو ، هەستی مرۆڤ پەیدا بووە ، سەرەتاکانی شۆڕشی فەرەنســـاو ئەندێشەکانی مارکســ‌و لینین لە گــەڵ مردوو بێ‌گیاندا ئەگونجێن ، نەك لە گەڵ مرۆڤێکی زیندودا(١٣) ٠

نوسەری بەرزی ڕۆمانیا کونستانتان جورجیو ئەڵێت : (من هەست ئەکەم کە ڕووداوێکی ناهەموارو بفە لە دەورماندا ڕووی داوە ، من نازانم لە کوێ سەری هەڵداوە ، وە کــەی دەستی پێ‌کــردووە ، وە چەندی پێ ئەچێت ؟ بەڵام هەست بە بوونی ئەکەم ٠ ئێمەی خستۆتە گێژاوێکەوە کە پێستمان ئەکەنێ (کەوڵمان ئەکات) وە ئێسقانەکانمان یــەك لە دوای یەك

---

(١١) ڕۆژنامەی الثورەی عێراقی ژمارە ٢٢٠٤ بەرواری ١٤/١٠/١٩٧٥٠
(١٢) گۆڤاری العربی کوەیتی ژمارة ٢٠٦ لاپەڕە/١٨٨
(١٣) الانسان ذلك المجهول ـ لاپەرە/٣٧ ، ٤٠

ئەشکێنێ • من هەست بەو ڕووداوە گەورە ئەکەم ، هەستێکی وا چـــۆن مشك پێش نوقم بوونی کەشتیەك هەستی پێ ئەکاتو هـەوڵی بەجـــێ هێشتنی کەشتیەکە ئەدات • بـەڵام هیچ پەناگایەکمـــان نییە لــــە هیچ جێگایەکی ئەم جیهانەدا(١٤) •

هەروەها ڕەوشت کە پێوەری هەڵسو کەوتو ڕەفتاری مرۆڤـە لـە ژیانی ڕۆژانەیدا ، لە پەیوەندیی نێوان ویژدانو دەرونی خۆیدا،پەیوەندی نیوان تاكو کۆمەڵ ، پەیوەندیی نێوان کۆمەڵێكو کۆمەڵانیتر • ڕژێمـــە مرۆڤ کردەکانی ئەم سەردەمە چ لە ڕۆژ ئاواو چ لە ڕۆژ هەڵات هەموویان لە یەك سەرچاوەی مادییەوە هەڵقوڵاون ئەگەرچـــی هەریەکـــەیان بـە شێوەیەکی جیاواز لەویتر خۆی ئەنوێنێ ، ڕۆژئاوای سەرمایەداری تاك پەرستەو سەربەستیەکی بێسنووری پێ بەخشیوە ، تابتوانێ بە هـەموو شێوەیەك ، وە بە هەر ڕێگایەك خۆی بیەوێ تێبکۆشێت بۆ گـــەیشتن بە ئامانجەکانی ئەگەرچی ئەو ڕێگایەی ئەیگرێتە بەر زیانیش بگـــەیەنێ بە خەڵکی ، وە یا لەسەر حسابی خەڵکی تریش بێت •

وە سۆشیالیستی ڕۆژ هەڵات کۆمەڵ پەرســتەو هیـــچ نرخێکـــی دانەناوە بۆ مرۆڤ ، وە مافی تاکی پێشێل کردووەو هیچ حسابێکـــی بۆ ناکات لەناو کۆمەڵدا نەبێت • بەڵام ئەوەی کە هەردوولا هاوبەشیان تێدا کردووە جیاکردنەوەی ڕەوشتە لە هەموو کاروبارێکی ژیان ، هەرچـــەندە وڵاتە سەرمایەدارەکان دان ئەنێن بە ڕەوشتدا ، بەڵام لە هەموو چالاکیەکی ئابووری جیای ئەکەنەوەو دووری ئەخەنەوە • خۆ لای مارکسیەکان وشەی ڕەوشت لە فەرهەنگیژیانیاندا سڕاوەتەوە•هەرچەندە دروشمی دادگەرییان

---

(١٤) تهافت العلمانية/لاپەڕە : ١٧٥

بەرز کردۆتەوەو داوای تێرکردنی پێویستیە گشتی‌یەکانی کۆمەڵ ئەکەن، بەڵام لە سەرچاوەیەکی نەگۆڕوو گیانیەوە وەرنەگیراوە ، بەڵکو هەموو بزوتنەوەیەکی مرۆڤایەتی ئەگێڕنەوە بۆ کەرەسەکانی بەرهەم هێنان (وسائل الانتاج) کە بزوێنەری مێژووی مرۆڤایەتی‌یە ، وە هیچ هۆیەکی گیانی لە دەرەوەی مادە کاری تێنەکردووە ٠ وە ئەڵێن : کەرەسەکانی بەرهەم هێنان مێژوو و پێشکەوتنی مرۆڤایەتی دروست ئەکەن٠لێرەدا نامەوێ درێژە بدەم بەم باسە چونکە ئەوەی مەبەستی منە ئەوەیە کە هەردوو ڕژێمەکە هیچ نرخێك دانانێن بۆ ڕەوشت لە ژیانی کۆمەڵدا ٠ ئەمەش وای لە شفیتزەری فەیلەسوف کردووە کە ئەڵێ :

ئەم شارستانیەتەی ئێستا توانای خۆڕاگرتنی نەماوە چونکە بچراوە لە پاسای بنەڕەتی شارستانیەت کە ڕەوشتە(١٥) ٠

هەر وەکو وتمان ڕوون بۆتەوە بۆ زۆر لە زاناکانی جیهان ، کە ئەو ڕژێمانەی ئێستا سەپێنراون بەسەر مرۆڤایەتی‌دا ،هیچیان ناگونجێن لە

---

(١٥) گۆڤاری العربی ژمارە ٢٠٦ کانونی دووهەمی سالی ١٩٧٦ ٠
البرت شفیتزر فەیلەسوفو پزیشكو مۆسیقا ژەنی بەناوبانگ لە ئەڵمانیا لە هەرێمی ئەلزاس لە سالی ١٨٧٥ لە دایك بووە ٠ لە سالی ١٨٩٣ چۆتە زانکۆی ستراسبورگ بۆ خوێندنی مۆسیقاو لاهوت ، دوای ئەوە چۆتە پاریس بۆ زانکۆی سۆربۆن بۆ خوێندنی فەلسەفە ، ئینجا بۆتە مامۆستای فەلسەفەو لاهوت لە زانکۆ پێشوەکەی ٠ ناوبانگی لە هەموو ئەوروپا دەرکرد ٠ لە سالی ١٩٠٦ دەستی دایە خوێندنی پزیشکی بۆ ئەوەی بچێتە ئەفریقا بۆ چارەسەری نەخۆشان ٠ دوای حەوت ساڵ بووە پزیشك ، ئینجا چووە بۆ ئەفریقا ٠ لە سالی ١٩٥٣ بەخشیشی نۆبڵی ئاشتی وەرگرت ٠ نزیکەی ٥٠ ساڵ لە خەستە خانەیەکی ئەفریقا خزمەتی کردووە وە هەر لەوێ لە سالی ١٩٦٥ کۆچی دوایی کردووە ٠

گەڵ سروشتو فیطرەی مرۆڤدا ، چونکە هەر ڕژێمەیان کــەسێك وەیان چەند کەسێك دایان ناوە ، کە ئەوانیش تەنها مرۆڤن ، وە هیچیان لــە مرۆڤ زیاتر نییە ، لەبەرئەوە نەیانتوانیوە بەتەواوی لە ناوەرۆکــی بیرو هەستو سروشتی مرۆڤ بگەن ، تا بتوانن ڕژێمێکی وای بۆ دابنێن کــە بگونجێت لەگەڵیاو بەختەوەری بکات ‥ وەکو دکتۆر ئەلکسیس کــاریل ئەڵێت : (ئێمە نەوەیەکی چارە ڕەشین ، چونکــە لە لایەنــی ڕەوشتو ژیری‌یەوە ڕوخاوین ، ئەو کۆمەڵو گەلانەی کە لەباری شارستانی‌و پیشە سازی‌یەوە زۆر پێشکەوتوون ، دەقاو دەق ئەو کۆمەڵو گەلانەن کە بەرەو لاوازی ئەڕۆن ، وە بەرەو (بەربەری‌و هەمەجیەت) ئەڕۆن بە خێرایی،ئـەو بێزاری‌و وەڕس بوونەی کە ئێستا دانیشتوانی شارە گەورەکانــی پێوە ئەتلێتەوە لە ڕژێمە ڕامیاری‌و ئابووری‌و کۆمەڵایــەتیەکانیــان پەیـدا بووە)(١٦) ·

کەوابو تەنها ڕژێمێك کە چارەسەرێکی ڕیشەیی گیروگرفتەکانــی کۆمەڵ بکات تەنها ئیسلامە ‥ چونکە تەنها ئیسلام ئەتوانێ مرۆڤایەتــی بگێڕێتەوە بۆ ڕێگای ڕاستو بیخاتــە ڕێ بــەرەو شارســتانیەکــی پێشکەوتووی‌وا کە مرۆڤایەتی تێدا بحەسێتەوە · وە هیچ گیروگرفتێکی ـ چ کۆمەڵایەتیی‌و چ ڕامیاری‌و چ نەفسی‌و ـ هتد ـ نەمێنێ ·

ئەم ڕاستیەشە ڕوون بۆتەوە بۆ زۆر لە زاناکانی جیهان · باوەڕیان هێناوە بە ڕژێمی ئیسلام،کە تاقە ڕژێمە دادگەری‌و بەختیاریی ببەخشێت بە مرۆڤ · هەروەکو فەیلەسوفی گەورەی فەرەنساش ڕۆجیە گــارودی ، کە لە ئیسلام کۆڵیەوەو باوەڕی پێ‌هێناو · وازی لە مارکسیەت هێنــا،وە لە یەکێ لە نوسراوەکانیدا ئەڵێ : (ئەگەر مارکس ئیسلامی بخویندایاوە ·

---

(١٦) الانسان ذلك المجهول ص٤١ ·

بیروڕای خۆی ئەگۆڕی بەرامبەر بە مێژووی مرۆڤایەتی)[١٧] هەروەها لە کتێبی (البدیل)دا هاواری لێبەرز بۆتەوە ، کە ئەم کۆمەڵگایەمـــان بەرەو لەناوچوون ئەڕوات . وە پێویستی بە گۆڕانێکی ڕیشەیی هـــەیە[١٨]وە دەیان زانای تریش کـــە لێرەدا ماوەی ئەوەمـــان نییە ناویان بـەرین وە بیروڕاکانیان بڵاوبکەینەوە ٠

ئینجا بابزانین بۆچی ئیسلام ئەتوانێ مرۆڤایەتی بەختەوەر بکات ؟ بۆچی ئەتوانێ ڕزگاری بکات لەو کۆتو زنجیرەی،ڕژێمە مرۆڤ کردەکانی ئەم سەردەمە کردویانەتە ملی ؟ وە ڕزگاری بکات لەو کێشەو گیروگرفتانەی نوێترین ڕژێمی هاوچەرخ نەیتوانیوە چارەسەری بکات . وە ناشتوانی . سەرەڕای ئەم هەموو پێشکەوتنە زانستی‌یەی لە جیهاندا بەدی هاتووە!٠

سەرەتا ئەبێ ئەوە بزانین ئایینی ئیسلام ڕژێمێکـــی خـوایی‌یە بۆ مرۆڤایەتی ، وە دوایین زنجیرەی ڕژێمو ئایینە خوایی‌یەکانە کە هاتوونـە خوارەوە بۆ ڕێنمایی‌و چارسەرکردنـــی کێشەکانـی کۆمەڵ بە درێژایی مێژوو ٠ وە ئاشکراشە لەبەر ئەوەی ئیسلام دوایین ڕژێمی خوایی‌یە ،لـە پێشکەوتووترین شێوەدا هاتۆتە خوارەوە ، تابتوانێ شـــان بەشـــانی پێشکەوتنی کۆمەڵی ئادەمیزاد بەپێی کاتو شوێن بڕوات ٠

لێرەدا زۆر کەس ئەکەونە هەڵەوە دەربارەی ئیسلام . وە وائەزانن، لەبەر ئەوەی ئیسلام ڕژێمێکی خوایی‌یە ، ئەبێ تەنها بەهاتنە خـوارەوەی جێبەجێ ببێت لەژیاندا ، وە پێویستی بە هیچ هەوڵو خۆهیلاك کردنێك نەبێت . هەروەکو چۆن بوونەوەرو مرۆڤی دروست کردووە ، وە چـــۆن

---

(١٧) حركة الاسلام ومفكرو الغرب/دكتور محسن عبدالحميد
(١٨) البديل/روجيه‌گارودی/ص٧

یاساکانی گەردون ئەبات بەڕێوە ، هەر بەو شێوەیەش ڕژێمی ئیسلام جێبەجێ بکات بە شێوەیەکی (سیحری) دوور لە زانینی مرۆڤ ، وە بەبێ هۆیەکی دیاری !. بەلام ئەمە هەلەیەکی زۆر گەورەیە ، ئەویش نەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتن لە سروشتی ئیسلامو چۆنیەتی جێبەجێ کردنی ، وەکو لە تاقی کردنەوەیەکی بێوێنەی مێژوویی‌دا لە سەرەتای پەیدا بوونیا جێبەجێ کرا .

بۆ ئەوەی ئێمە لەو هەلەیە دوور بکەوینەوە ، ئەبێ ئەوە بزانین ، ئیسلام ڕژێمە بۆ ژیانی مرۆڤ،وە بە پێی تواناو وزەی مرۆڤو بارودۆخی تایبەتی ئەو کاتو شوێنەی تیا ئەژی جێبەجێ ئەکرێت ، وە پلەی سەرکەوتنی بەستراوە بە چۆنیەتی‌و چەندایەتی باوەڕ پێهێنانی‌و ئەو هەوڵو کۆششەی کە ئەدرێت بۆ جێبەجێ کردنی ، هەر چەندە هەندێ کەس کاتێ بۆیان دەرئەکەوێت ڕژێمی ئیسلام لە سنوری ووزەو تواناو هەوڵی مرۆڤدا جێبەجێ ئەکرێت ، یەکسەر ڕەش‌بین ئەبن ، تا ئەو ڕادەیەی هەندێك گومان لە ڕاستیی ئیسلام پەیدا ئەکەن،چونکە چاوەڕوانن بە شێوەیەکی دوور لە هەوڵدانو خۆ هیلاك کردن جێبەجێ ببێت . هەندێکی تریش کە ئەبینن ئیسلامیش هەر بە تێکۆشانی مرۆڤو لە سنوری تواناو هەلو مەرجی تایبەتی‌دا لە ژیانی کۆمەلدا جێبەجێ ئەکرێت ، ئەلێن ئیتر جیاوازی چیە لە نێوان ئیسلامو ڕژێمەکانی تری هاوچەرخ . ئەوانیش هەر بەو شێوەیە جێبەجێ ئەکرێن ، وە ئێستاش چەسپاون لە ژیانی مرۆڤایەتی‌دا ؟!

لێرەدا لە وەلامی ئەو جۆرە کەسانەدا ، بۆ ئەوەی باشتر لە ئیسلام بگەن ئەو هۆیانە ڕوون ئەکەینەوە کە بۆتە هۆی ئەوەی ئێمە لە پێناوی

ئیسلامدا تێبکۆشین کە جێبەجێی بکەین،وە لە ڕژێمەکانی تری جیهان دوور بکەوینەوە :

١ ـ گرنگترین هۆ کە پاڵمان پێوە ئەنێ بۆ جێبەجێ کردنی ئیسلام لە ژیانماندا ، ئەوەیە ئێمە موسڵمانین ، وە باوەڕمان بە خوای پەروەردگار هەیە ، وە باوەڕمان هێناوە کە ئیسلام ڕژێمێکە لە لایەن خواوە نێراوە بۆ سەر مرۆڤ ، وە بە زمان باوەڕمان ئاشکرا ئەکەین بە بەڵگـــەی باوەڕ : **(أشهد ان لااله الا الله واشهد ان محمداً رسول الله)** واتە باوەڕم هەیە کە هیچ خوایەك نییە تەنها یەزدانی پەروەردگار نەبێت ، وە باوەڕم هەیە محمد ڕەوانە کراوی خوایەو هەڵگری ڕژێمی ئیسلامە بۆ هەموو مرۆڤایەتی ٠

کەوابوو لە بەر ئەوەی بەدڵ باوەڕمان هەیە ، پێویستە ئەم باوەڕە بکەین بە کردەوە ، چونکـــە پێغەمبەر (درودو سەلامی خـــوای لێبێت فەرموویەتی : (باوەڕ بە خوا بە داخوازی نییە ، بەڵکو باوەڕ ئەوەیە کـــە جێگیر ئەبێ لە دڵداو،کردەوەش ئەیسەلمێنێ)واتە کردنی ئەو بیروباوەڕە بە کردەوەی ڕۆژانە لە ژیاندا ، نەك تەنها بە قسەو لاف لێدان ٠

خوای گەورە فەرموویەتی :

**(ومن لم یحکـــم بما انـــزل الله فاؤلئك هم الکـــافرون) المـــائدة/٤٦**
واتە : هەرکەسێ فەرمانڕەوایی بەو ڕژێمە نەکات کە خوا ناردوویەتـــی بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد ، کافرە ، واتە موسڵمان نییە ٠ ئینجا لێرەدا ڕاستی باوەڕ بوونمان بەخوا ئەوەیە کـــە بەدڵ باوەڕ بهێنین بە ئیسـلام کـــە ڕژێمێکی خواییەو ، هەوڵیش بدەین بیکەین بە کردەوە ، واتە ئەو ڕژێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا جێبەجێ بکەین ، بۆ ئەوەی موسڵمانی ڕاستەقینـــە بین ٠ چونکە ڕژێم دانان یەکێکە لە نیشانە گـــرنگ سەرەکیەکانـــی

خوایەتی ٠ کەس بۆی نییە ڕژێم دابنێ بۆ مرۆڤ لە هیچ بارێکی ژیاندا ـ چ کۆمەڵایەتیی‌و چ ڕامیاریی‌و چ ئابووریی‌و ٠٠هتد ـ وە هەر کەسێ ڕژێم‌و بەرنامەی ژیان دابنێ بۆ مرۆڤ . واتە داوای خوایـەتـی ئەکات ، وە ئەوانەی کە دوای ئەکەون‌و پەیڕەوی ڕژێمەکەی ئەکـەن ، ئەو کەسـە ئەپەرستن ٠ چونکە جارێکیان پێغەمبەر (دروود سەلامی خوای لێ بێت) ئەم ئایەتە پیرۆزەی ئەخوێندەوە **(اتخذوا احبارهم ورهبانهم ارباباً من دون الله والمسيح ابن مريم وما امروا الا ليعبدوا الهاً واحداً لا اله ألا هو سبحانه عما يشركون) التوبة ٣١٠** واتە : لە بریتی خوا قەشـەو پیاوە ئایینییەکانیان ئەپەرست ، خۆ ئەوان هیچ فەرمانیان پێنەکرابوو ، کە بێجگە لە خوایەکی تاک‌و تەنها کەسیتر بپەرستن٠ ئەوانەی لەگەڵیا بوون وتیان : خۆ ئەوان قەشەکانی خۆیان نەپەرستووە، بەڵام پێغەمبەر (دروودو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی : بەڵێ پەرستویانن ، چونکـە ئـەوان حەڵاڵیان بۆ حەرام کردوون ، وە حەرامیان بۆ حەڵاڵ کردوون، ئەمانیش، بە قسەیان کردوون وپەیڕەویان کردوون ، ئەوە پەرستنیان بووە بۆیان ٠

کەوابوو جێبەجێ کردن‌و شوێن کەوتنی هەر ڕژێمێک جگـە لـە ئیسلام دوورکەوتنەوەیە لە خـواو ئایینی ئیسـلام ، وە پەرستنی ئەو کەسانەیە کە ڕژێمەکەیان داناوە ٠

٢ ـ بۆیە داوای جێبەجێ کردنی ڕژێمی ئیسلام ئەکەین ، چونکـە هەروەکو وتمان ، ڕژێمێکـی خوایی‌یە ، لەبەر ئەوە دوورە لە دەسـتی مرۆڤ‌و کەم‌و کوڕی‌و هەوەس‌و ئارەزوو نەفامـی ، وە دوورە لـە ڕق‌و کینەی ٠ چونکە خوای گەورە ، خوای هەموو مرۆڤایەتی‌یـەو ڕژێمێکـی گشتی بۆ هەموو مرۆڤ داناوە ، بەبێ جیـاوازی ، وە بەبێ ئەوەی لەبەر خاتری کەسێك وە یان چینێك وە یان میللەتێك دایبنابێ ، بەڵکو هەموویان

لای خوای گەورە یەك چینن ، وە بە یەك چاو سەیر ئەکرێن · پێغەمبەر (درودو سەلامی لێ بێت) فەرموویەتی : (هەمووتان لە ئادەمن ، وە ئادەمیش لە گڵە) هەروەها فەرموویەتی : (هەمووتان وەکو دەنکی شانە وان ـ واتە یەکسانن) ·

بەڵام ڕژێمە مرۆڤ کردەکانی هاو چەرخ هەریەکەیان کەسێك وە یا کۆمەڵێك بە ئارزەوی دڵی خۆیان ، وە بە پێی تواناو زانیاریان دایان ناوە ، لەبەر ئەوەشە لایەك ئاك پەرستەو تاکی داوە بە سەر کۆمەڵدا ، لایەکی تریش چین پەرستەو چینێکی داوە بەسەر چینەکانی تردا ، یەکێکی‌تر نەتەوەپەرستەو ، نەتەوەیەکی داوە بەسەر نەتەوەکانی تردا ، وە هەمووشیان لایەنی (مادی) مرۆڤیان داوە بەسەر لایەنی گیانی‌دا (روحي) · کەوابوو تەنها ئیسلامە بەرژەوەندی مرۆڤێکی لە گەڵ بەرژەوەندی کۆمەڵدا لە سنورێکی یەکسانو دادگەردا ڕێکخستووە ، هەروەها بەرژەوەندی کۆمەڵێكو کۆمەڵێکی ترو،میللەتێكو میللەتێکی تری لە سنورێکی یەکساندا ڕێکخستووە،وە لایەنی(مادی) مرۆڤو لایەنی گیانی بە شێوەیەکی مام ناوەندی دیاری کردووە ·

٣ ـ بۆیە داوای جێبەجێ کردنی ئیسلام ئەکەین ، چونکە ڕژێمێکی خوایی‌یە ، خوای گەورەش پەروەردگاری هەموو بونەوەرو ئادەمیزادە ، وە تەنها ئەویش لە سروشتو هەستو ، ئارەزوو و پێویستی‌یەکانی مرۆڤ شارەزایە ، وە ئەویش ئەزانێ کە چ ڕژێمێك بە کەڵکی دێت،وە چی بەختەوەری ئەکاتو ، دادگەری لە ناویاندا بڵاو ئەکاتەوە ، وە چ ڕژێمێك لە سەر بناغەیەکی پتەوو ڕاست مرۆڤایەتی پێش ئەخات · دکتۆر ئەلکسیس کاریل ئەڵێ : شارستانێتی هاوچەرخ خۆی لە هەڵوێستێکی گراند ئەبینێ؛چونکە ناگونجێ لە گەڵماندا،دوور لە سروشتی‌ڕاستەقینەی

مرۆڤ دامەزراوە ، لە ئەندێشەی دۆزراوە زانستیەکانو ئارەزووی چەند کەسێك پەیدا بووە(١٩) ٠

٤ ـ لایەنێکیتر لە لایەنە گرنگەکانی ڕژێمی ئیسلام پشت بە خوا بەستنە ، کە دڵنیاییو بەختیارییو ئاسوودەیی ، ئەڕژێنێ بەسەر مرۆڤدا، ئەویش بە هۆی بوونی پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ ، بە خوای گەورەوە ، بەبێ هیچ هۆیەك ، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە بە هۆی هیچ واسطەو شێخو کەسێکەوە پەیوەندیناکرێت بە خوای گەورەوە، بەڵکو ڕاستەوخۆ، هەرکەسە لە ئاستی خۆی ، لە هەموو سوچێکی ئەم جیهانەدا توانای پەیوەندی گیانی هەیە بە خوای گەورەوە ٠ وە ئەم پەیوەندیە ڕاستەو خۆیە وا لە مرۆڤ ئەکات ، هەست بە سەربەستیەکی تەواو بکات ، وە دڵنیابێ لە هەموو کاروبارێکی ژیاندا ، کە تەنها خوای گەورە دەسەڵاتی هەیە بەسەریاو ، ئەویش ئەتوانێ قازانج یا زیانی پێ بگەیەنێ ، ئیتر هیچ کەسێك توانای ئەوەی نییە ، چ قازانجو چ زیانی بگەیەنێ بە مرۆڤ ٠
**(قل لن يصيبنا الا ما كتب الله لنا هو مولانا)٠**

واتە ! بڵێ تووشی هیچ نابین ئەوەی خوا نەینوسیبێ بۆمان ٠ وە خوای گەورە بە هاواری هەموو کەسێکەوە دێت ، وە داڵدەی ئەدات ، وەکو لە قورئاندا فەرموویەتی :
**(واذا سألك عبادي عني فأني قريب اجيب دعوة الداعي اذا دعان ، فليستجيبوا لي وليؤمنوا بي لعلهم يرشدون) البقرة/١٨٦ ٠**

واتە : خوا بە پێغەمبەر ئەفەرموێ : ئەگەر لێیان پرسیت لە بارەی منەوە ، من نزیکم ، وە وەڵامی هەموو داخوازیەك ئەدەمەوە ـ دێم بە هاوار هەموو کەسێکەوە ـ ئەگەر داوای کرد لە من ، دەبا داوا لە من بکەن،وە باوەڕیان بە من بێ بەڵکو سەربکەون ٠

---

(١٩) الانسان ذلك المجهول ٠

: (وقال ربكم ادعوني استجب لكم) .
واته : پەروەردگارتان ئەفەرمووێ : لێم بپاڕێنەوە منیش دێم بـــە هاوارتانەوە .

ئەم سەرەتا ئیســـلامیە ـ کـــە پشت بەستنە بـــە یـــەزدان ـ سەربەستی‌یەکی تەواو ئەبەخشێت بە مرۆڤ ، کە هەست ئەکـــات هیچ هێزێك جگە لە خوا دەسەلاتی نییە بە ســـەریا ، وە ئـــەم سەربەستیەش مانای ئەوەیە ، مرۆڤ دڵنیایە لە ژیانو گیانو سامانو ئابڕووی ، وە لــە جێگاو شوێنی لە ژیاندا وە هەموو مافێکی پارێزراوە،تەنها ئەوەی پێویستە لە سەری ئەبێ باوەڕی تەواوی هەبێت بە خوای گەورە ، وە تەنها پشت بەو ببەستێت ، وە هەموو هەوڵو کۆششێکی لە پێناوی ڕازی بوونـــی خوادا بێت . وە هەرگیز بێزارو سەرسامو دلگران نەبێت ، چونکە هەموو شتێك بە دەست خوای گەورەیە (والله معكم ولن يتركم اعمالكم)محمد/٣٥
واتە : خوا لە گەڵتانایە وە ڕەنجتان بەزایە نادات .

ئەم بیروڕایە یەکێکە لە گرنگترین هۆکـــانی چارەسەری ئـــەو گیروگرفتە دەروونی‌یانە (نفسی)ی کە توشی مرۆڤایەتی بوون،وە پێوەی ئەتلێنەوە . بەلام ئەم پشت بە خوا بەستنەو ئـــەم پەیوەندی‌یە ڕاستەو خۆیە ئەوە ناگەیەنێ کە مرۆڤ دەستەوسان دابنیشێ ، چاوەڕێ‌بێ لــە ئاسمانەوە بۆی بباریێ ، وە دەستێکی نهێنی گیروگرفتەکانی چـارەسەر بکات . بەڵکو پێویستە هەموو تواناو چالاکیەکی خۆی بەکـــاربهێنێ،وە هەرچی ڕێگای ڕەوا هەیە بیگرێتەبەر بۆ گەیشتن بە ئامانجەکـــانی لــە ژیاندا . جارێکیان پیاوێك چووە خزمەت پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لێ بێت) کە دانیشت پێغەمبەر لێی پرسی ووشترەکەت چی لێ‌کرد،کابرا وتی : داومەتە دەست خوا ـ مەبەستی ئەوە بووە کە بەرەڵای کردووە ـ

بەڵام پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: برۆ ببەستەرەوە ئینجا بیدەرە دەست خوا .

ئەم دڵنیابوونەش وا لە مرۆڤ ئەکات لە ژیانێکی پڕ لە هەستی برایەتیو دۆستایەتیو ئاشتیدا بژی ، وە هیچ ڕقو کینەو جیاوازییەکی چینایەتی نەبێ لە نێوانیاندا . وەکو پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی : (کەستان باوەڕتان (الایمان) نابێت تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت) . کەوابوو پێویستە لە سەر موسڵمان بۆ گەیشتن بەو ڕێبازانەی ئیسلام دیاری کردووە ، هەڵسێ بە جێبەجێ کردنی دەستوورەکانی ئیسلام بە تەواویو بە بێ کەمو کوڕیو خۆ گێل کردن لە ناوەڕۆکو مەبەستەکانی .

ئەمەش مانای ئەوەیە فەرمانڕەوانی موسڵمانان بۆیان نییە لەخۆیانەوە ، خۆیان بسەپێنن بەسەر خەلکیداو ، بە ئارەزووی خۆیان ڕەفتار بکەن ، بەڵکو لەسەریانە ڕژێمو یاساکانی ئیسلام جێبەجێ بکەن ، وە هەرکاتێ لە سنووری دەسەڵاتی دیاری کراوی خۆیان لایاندا، موسڵمانان بۆیان هەیە بە ئاشکرا بچن بە گژیانداو لە کاریان بخەن ، وە فەرمانڕەوای تر هەڵبژێرن ، هەروەکو پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی : (ملکەچیو گوێ ڕایەڵی نییە بۆ موسڵمانان لە ئاستی لادان لە فەرمانەکانی خوا) هەروەها (د.خ) فەرموویەتی : (گەورەترین شەهید ئەو کەسەیە بەبێ ترس قسەی ڕاست بکات لە ڕووی فەرمانڕەوای ستەمکاردا) . هەروەها وتاری جێگرەکانی پێغەمبەر (د.خ) باشترین بەڵگەیە بۆ ئەم مەبەستە . وەکو جێگری یەکەم ئەبوبەکری سدیق (خ) لە وتارێکدا فەرموویەتی :

(من کراوم بە ڕێبەری ئێوە ، بەڵام چاکترینتان نیم ، ئەگەر دیتان ڕاست ئەڕۆم ئەوا چاودێریم بکەن ، ئەگەر لامدا ڕاستم بکەنەوە ، بەهێزتان لای

من بێهێزە تا هەقی لێئەستێنم ، وە بێهێزتان لای من بەهێزە تا هەقی بۆ وەردەگرمەوە) ٠

بەم شێوەیە برایەتیو ئاشتیو خۆشەویستی جێگای شەڕو شۆڕو جیاوازی چینایەتیو ، ڕقو کینەی شارستانێتی هاوچەرخ ، ئەگرێتەوە ٠ بەڵگەنەویستە هەموو ئەو کارەساتانەی بەسەر ئێمەدا ـ گەلانی موسڵمان ـ هاتووە ، وە یان بەسەرمان دێت ، هۆکەی لادانمانە لە ڕاستەقینەی ڕژێمی ئیسلام **(أفغیر دین الله یبغون وله اسلم من في السموات والارض طوعاً وکرهاً والیه یرجعون) آل عمران/٨٣** واتە: ئایا ئێوە جگە لە ئایینی خوا، ئایینێکی ترتان ئەوێت؟ ئەوەی کە لە ئاسمانو زەویدایە ملکەچی فەرمانی ئەون پێیان خۆشبێت یان نا ، وە هەر بۆ لای ئەویش ئەگەڕێنەوە ٠

**٥ ـ چاودێری دوولایەن :**

لە ڕژێمەکانی ئەم سەردەمەدا ـ چ سەرمایەداریو چ سۆشیالیستی ـ مرۆڤو چالاکیەکانی لە سنوری (مادە) دەرناچێت ، جیهان لای ئەوان تەنها مادەیە ، ئیتر هیچ گوێ نادەن بە لایەنی گیانی ٠

لە ئەنجامێکی سروشتی ئەو ڕژێمانەیە پەیدابوونی ناکۆکی چینایەتی لە وڵاتە سەرمایەدارەکاندا ، وە پەیدا بوونی بەزۆر خۆسەپاندن بەسەر خەڵکیدا لە وڵاتە سۆشیالیستەکاندا(٢٠) ، لەبەر ئەوە مرۆڤ لەو

(٢٠) ڕژێمی ڕامیاری وڵاتە سوشیالیستەکان ڕژێمی یەك پارتە ، وە هیچ هەڵبژاردنێك نییە ، وە هیچ پارتو کۆمەڵێك نییە بەئاشکرا ناکۆکی پارتی فەرمانڕەوا بێت، هەروەها داگیر کردنی چیکۆسلۆفاکیا لە ساڵی ١٩٦٧ وە ئەفغانستان لەم کاتانەدا نمونەیەکی ئاشکرای بەزۆر خۆسەپاندنە ٠

ڕژێمانەدا هیچ ئاواتێکی گیانی نییە ـ هەروەکو لە پێشەوە ڕونمـــان کردەوە ـ جگە لە ئاواتو ئارەزووە مادیـەکان ، وە هـەموو شتێ لـە ڕوانگەیەکی مادییەوە ئەبینێ ٠

بەڵام لە ڕژێمی ئیسلامدا ، هەرچەندە چالاکی مادیو هەوڵدان لـــە پێناوی بەرز کردنەوەی ئاستی مادی ژیان مەبەستەو زۆریش گرنگـــی پێ دراوە ، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا ، خۆی لە خۆیدا ئامانجو ویستی مرۆڤی موسڵمان نییە ، بەڵکو تەنها ڕێگایە بۆ گەیشتن بە ئامانجی سەرەکی کە ڕەزامەندی خوای پەروەردگارە ، لەبەر ئەوە لای موسڵمان (جیهان کێڵگەی دوا ڕۆژە) ٠ وە خوای گەورە فەرموویەتی :
**(ولا تكونوا كالذين نسوا الله فانساهم انفسهم) الحشر/١٨** واتە:وەکو ئەوانە مەبن کە خوایان لەبیرکرد ، بۆیە خوایش خۆیانی لەبیربردنەوە ٠ ئیسلام نە چالاکی مادییو گیانیی لەیەك جیائەکاتەوە ، وە نە هەوڵدان بۆ ژیانی جیهانو دوا ڕۆژ جیائەکاتەوە ، بەڵکو بەیەك چاو وە لە یەك کـــاتا ئەیان بینێ ، وە شان بەشانی یەکتر هەوڵیان بۆ ئەدات ، وەکو پێغەمبەری مەزن (د٠خ) فەرموویەتی : (وا ئیش بکە بۆ جیهان وەکو هەرگیز نەمریت، وە واش ئیش بکە بۆ دواڕۆژ (قیامەت) وەکو سبەینێ بمریت) ٠

لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە چاودێریو سەرپەرشتی لە ئیسلامدا دوولایەنە یەکەم چاودێریو گرنگترینیان ، چاودێری خودی مرۆڤە کە لـە ویژدانو بیروباوەڕی مرۆڤدا خۆی ئەنوێنێ،وە لە ئەنجامی باوەڕ بەخوا، ترسو هیوای ڕۆژی زیندوو بوونەوە پـــەیدا ئەبێت ، لێرەدا مرۆڤـــی موسڵمان خۆی لە خۆیدا چاودێرو سەرپەرشتی کەرێکی گەورەی هەیە،کە دووری ئەخاتەوە لە هەموو لادانێك لە سنووری یاساو ، خراپەکـردنو زیان گەیاندن بە خەڵکی ، وە لە هەمان کاتدا هانی ئەدات بۆ چاکە کردنو

ڕەفتار کردن بە پێی دەستوورەکانی ئیسلام ، وە چوون بەگژ هەموو نالەباریو لادانێك لە ڕاستی لە کۆمەڵدا چونکە ئەمانە تێکۆشانن بۆ گەیشتن بە ئامانجی موسڵمانان کە ڕەزامەندی خوای گەورەیە ٠

بێگومان ئەم جۆرە چاودێری‌یە لە هیچ ڕژێمێکی ئەم سەردەمەدا نییە ، جگە لە ڕژێمە ئایینی‌یەکان ، کە هاندەری ئایینیو باوەڕ بە خواو ڕۆژی زیندووبوونەوە دروستی ئەکات ٠

ئەم جۆرە چاودێری‌یە کارێکی گرنگی هەیە لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤو کۆمەڵدا ٠ چونکە مرۆڤ ئاشکرایە لای ، ئەگەر لە چاودێری یاسا ڕابکاتو خۆی بشارێتەوە ، ناتوانێ لە چاودێری خوای گەورە ڕابکات ، کە لە ناوەڕۆکی دەروونی مرۆڤ ئاگادارە :

**(ربکم أعلمُ بما في نفوسكم) الاسراء/٢٥** واتە : خوای ئێوە ئەزانێ چی لە دەرونتانا هەیە ٠

ئینجا سەرەڕای چاودێری خودی لە ئیسلامدا ، چاودێری گشتی کارێکی گرنگی هەیە ، کە ئەویش لە ئەنجامی دەستوورە گرنگەکانی ئیسلامە ٠ پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی : **(موسڵمان ئاوێنەی موسڵمانە)** واتە : هەموو موسڵمانێك ئەرکی سەرشانیەتی ، ڕەفتارو هەڵسو کەوتی براکەی هەڵسەنگێنێ ، وە هەموو کەمو کوڕی‌یەکانی بخاتە پێش چاوی ، بۆ ئەوەی لە ڕێگای ڕاست لانەدات،وە نەبێتە کۆسپ لە ڕێگای کارووباری موسڵمانانندا ٠ پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی : (هەرکەسێ لە ئێوە خراپەیەکی دی ، ئەبێ بیگۆڕێ بە دەست ، ئەگەر نەیتوانی بە دەم ــ بەقسە ــ وە ئەگەر نەیتوانی ، ئەبێ بە دڵ بی‌بوغزێنێ ، کە ئەویش لاوازترین پلەی باوەڕە) واتە ئەرکی سەرشانی موسڵمانە بەرگری لە خراپەکاریو لادان بکات لە کۆمەڵدا ٠ وە ئەبێ بە پێی توانای خۆی هەوڵ

بدات بۆ نەهێلآنی چ بەدەست واتە بەزۆر ، چ بەدەم واتە بە ئامۆژگاریو ڕاگەیاندن ، وە یان هیچ نەبێ بەدڵ بی‌بوغزێنێ ، کە نیشاتـــەی لاوازی باوەڕە لە مرۆڤی موسڵماندا ٠

هەروەها سەرەڕای چاودێری خودیو ، چاودێری گشتی کۆمەڵـکە، گرنگترین چاودێرین ـ ئیسلام وەکو هەموو ڕژێمێکـــی ئەم سەردەمە ، چاودێری یاسایشی داناوە کە بریتی‌یە لە دەسەڵاتی یاســاو دەزگاکانی چاودێری دەوڵەت لە سنووری یاسای ئیسلامدا ، کە هەموو کاروبارێکی تێدا دیاری کراوەو بە درێژی شی‌کراوەتەوە ٠

# گیروگرفتی ئابووری

— گیروگرفتی ئابووری ·
— گیروگرفتی ئابووری لە ڕوانگەی سەرمایەداری‌یەوە ·
— گیروگرفتی ئابووری لە ڕوانگەی مارکسایەتیەوە ·
— گیروگرفتی ئابووری لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ·
— دەزگای دابەش کردن
— کارکردن
— کار لە ڕوانگەی سەرمایەداری‌یەوە ·
— کار لە ڕوانگەی سوشیالیستی مارکسی‌یەوە ·
— کار لە ڕوانگەی کۆمەنستی‌یەوە ·
— کار لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ·
— پێویستی ·
— پێویستی لە ڕوانگەی سەرمایەداری‌یەوە ·
— پێویستی لە ڕوانگەی سوشیالیستی مارکسی‌یەوە ·
— پێویستی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ·

## گیروگرفتی ئابووری :

یەکێ لە گرنگترین گیروگرفتە کۆمەڵایەتی‌یەکان لە ژیانی مرۆڤایەتی‌دا ، گیروگرفتی ئابووری‌یە،کە کارێکی گەورەی کردۆتە سەر ژیانی مرۆڤو ڕەفتارو هەڵس‌و کەوتی :

هەموو ڕێبازە ئابووری‌یەکان لەسەر ئەوە یەك‌کەوتوون ، کە لە ژیانی ئابووری‌دا ئەم گیروگرفتە هەیەو ، پێویستە چارەسەر بکرێت ٠ بەڵام لە دیاری کردنی سروشتی ئەو گیروگرفتەو هۆکانی‌و ، لە شێوەی چارەسەر کردنیا جیا ئەبنەوە ، وە هەر یەکەیان ــ واتە هەر ڕێبازێك ــ لە ڕوانگەی تایبەتی بیروڕای خۆیەوە بۆی ئەڕوانێت وە چارەسەری بۆ دیاری ئەکات ٠

## گیروگرفت لە ڕوانگەی سەرمایەداری‌یەوە :

ئابووری ناسە سەرمایەدارەکان وابیرئەکەنەوە کە گیروگرفتی ئابووری بریتی‌یە ، لە بەنارەحەت گەیشتن بە هەموو پێویستی‌یەکانی مرۆڤ، وە تێرکردنیان،هۆی ئەمەش ئەگێڕنەوە بۆ دانە بەرهەم هێنەکان (عوامل الانتاج) لە چاو پێویستی‌یەکانی مرۆڤدا ، چونکە سروشتو سامانە سروشتی‌یەکان دیارین‌و ناتوانرێ نە لەپانتایی زەوی زیاد بکرێت، وە نە لەو سامانانەی لە ناو زەویدان ٠ لە کاتێکا پێویستی‌یەکانی مرۆڤ ڕۆژ بەڕۆژ لە گەشەکردن‌و پتربووندان، بەپێی پێشکەوتنی‌شارستانیەت‌و، پتربوونی ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی ٠ ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە سروشت ناتوانێ پێویستی‌یەکانی مرۆڤایەتی دابین بکات ، وە لە ئەنجامدا گیروگرفتی ئابووری پەیدا ئەبێت(٢١) ٠

---

(٢١) المدخل الى النظرية الاقتصادية في المنهج الاسلامي/دكتور احمد النجار ص٨٩ ٠

ڕێگه چارەی ئەم ڕێبازە بۆ ئەو گیروگرفته ئەوەیه که پێی ئەڵێن : ڕژێمی بازاڕ ، یان پرۆژەی سەربەست ، ئەویش بە دانانی قازانج بە بزوێنەری سەرەکی دابەش کردنی بەرهەمو ڕێکخستنی بەکاربردن (استهلاك) • ئەمەشی لەسەر بناغەی خاوەندارێتی تایبەتی داڕشتووە کە خاوەندارێەکی سەربەستو بێسنوورە(٢٢) •

## گیروگرفت له ڕوانگەی مارکسایەتییەوە

ئابووریناسه مارکسیەکان وا بیرئەکەنەوە ، کە گیروگرفتی ئابووری بریتییه لە ناکۆکی هێزەکانی بەرهەم هێنانو پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان(٢٣) ، وە هەرکاتێ ڕێکەوتن پەیدا بوو له

(٢٢) اسس ومبادىء الاقتصاد الاشتراكي/عبدالوهاب الباهري•

(٢٣) مارکسیەکان شێوەی بەرهەم هێنانیان لە مێژوودا کردووە بە پێنج بەشەوە : کۆمەنستی سەرەتایی ، کۆیلەیی ، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری ، سۆشیالیستی ، کە بەبیروڕای ئەوان دوای ئەمیش کۆمەنستی پەیدا ئەبێت ، وە یان ئەڵێن سۆشیالیستی بناغەیە بۆ کۆمەنستی ، کە زیاتر لە ٦٥ ساڵە خەریکن وە تا ئێستاش بەرەودوا ڕۆیشتوون نەك بەرەو کۆمەنستی •

**شێوەی بەرهەم هێنان :**

بریتییه (له لای مارکسیەکان) لە ڕێکەوتن و هاوسەنگی لە نێوان پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان لە گەڵ هێزەکانی بەرهەم هێنان (هێزی ئیشوکار ، وە کەرەسەکانی بەرهەم هێنان) وە ئەوان ئەڵێن : هەرکاتێ ڕێکەوتن نەما لە نێوانیاندا ، پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان ئەبێتە کۆسپ لە ڕێگای گەشەکردنی هێزەکانی بەرهەم هێناندا •

پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان بریتین لەو پەیوەندیانەی لە ناو خەڵکیدا هەن لە کاتی بەرهەم هێنانو دابەش کردنی سامانه کانداە• ئەم پەیوەندیانەش شێوەی جیاجیا وەرئەگرن ، وە ئەم شێوانەش پشت بە خاوەندارێتی کەرەسەکانی بەرهەم هێنان ئەبەستن •

نێوان ئەو هێزو پەیوەندیانەدا ، ئاسایش باڵ ئـەکێشێ بە سەر ژیانـــی ئابووریداو گیروگرفت نامێنێ • ڕێگە چـــارەی ئەمانیش ئەوەیە کـــە لایەنێکی ناوەندی (مرکزی) خۆی ئەسەپێنێ بەسەر کاروباری ئابووریدا، وە سنوور بۆ بەرهەم هێنان، بەکاربردنیش بە چەندایەتیو جۆرایەتییەوە دیاری ئەکات ، بەڵکو ئیشوکاری هەموو کـەسێك لـــەم ڕژێمەدا دیاری کراوە ،مرۆڤ لە هەڵبژاردنی ئیشوکارو نەخشەکێشان بۆ ئیشوکارەکانی سەرپەست نییە ، وسنووری ئیشوکاری بریتییە لە جێبەجێ کردنی ئەو یاساو دەستورانە کە لەو لایەنە ناوەندییەوە دەرئەچێت • لـــەم ڕژێمەدا بازارو ملەملێ نییە ، بەڵکو مەبەست تێرکردنی پێویستییەکانی زۆربەی خەڵکە ـ وەکو خۆیان ئەڵێن ـ نەك مەبەست قازانج بێت وەکـــو ڕژێمی سەرمایەداری • بەڵام ئەوەی شایانی باسە لـەم دواییەدا هەندێ لـــە ئابووری ناسەکانیان داوای ئەوە ئەکەن کە پشت بە قازانج ببەســـترێ وەکو پێوەرێك بۆ ئاراستە کردنی وزە مادیەکان وە خەملاندنی بەرهـــەمی پێویست بۆ کۆمەڵ(٢٤) •

## گیروگرفت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە :

ڕێبازی ئابووری ئیسلام بە شێوەیەکـــی جیاواز لە ڕێبازەکـانیتر ئەڕوانێتە گیروگرفتی ئابووری ، نە بەگیروگرفتی سروشتو سامانەکانی ئەزانێ • وە نە بەناکۆکـی نێوان شێوەی بەرهـەم هێنـــانو پەیوەندی بەرهەم هێنان• بەڵکو بە گیروگرفتی مرۆڤی ئەزانێ • ئەویش بە نالەبارییو بێدادی دابەش کـــردنو وەبەر نەهێنـــانی سـروشتو سامانەکانـــی بەشێوەیەکی تەواو باشتر •

---

(٢٤) المدخل الى النظرية الاقتصادية/لاپەڕە/١٠٤

ڕێکخراوی خواردەمەنیو کشتوکاڵی نێوگەلان بڵاوی کـــردەوە ، ئەوەندە خواردەمەنی هەیە لە جیهاندا بەشی هەمووی بکات بەڵام نەبوونی دادگەری لە دابەش کردندا بۆتە هۆی زیاتر بوونی برسێتی بـــە ڕێژەی لە سەدا (١٤) لە ساڵی ١٩٧٠ وە تا ساڵی ١٩٧٨ی زایینی ٠

هەروەها ڕاپۆرتێکی تری هەمان ڕێکخراو،دەربارەی باری خۆراکی نێوگەلان ، لە مانگی مارتی ساڵی ١٩٧٨ کە لە ڕۆما بڵاوکرایەوە ڕوونـــی کردۆتەوە ، ژمارەی ئەوانەی لە خراپ خۆراکیدا ئەژین لە جیهاندا ،لـــە (٤٠٠) ملێون کەسەوە لە ساڵی ١٩٧١ وە زیاتـــر بووە بۆ (٤٥٥) ملێون کەس لە ساڵی ١٩٧٤ی زایینیدا ٠ هەمان سەرچـاوە ئەڵێت (٤٥) وڵات تووشی کەم خۆراکی بوون لە جیهاندا ، لەوانەش : بەنگلادشو میســرو هیندو ئەثیوبیاو کینیاو ٠٠ هتد(٢٥) ٠

بۆ بەرگری لە گیروگرفتی ئابووری ، ئیسلام ڕێگە چارەی بنەڕەتی داناوە ، ئەویش بریتییە لەو یاساو دەستورانەی کە هێڵە سەرەکیەکانی ڕێبازی ئابووری ئیسلامی لێپێك هاتووە ٠ بە تایبەتی ئەو دەســـتورو ئاراستە کردنانەی کە دانراوە بۆ پایە سەرەکیەکـــانی ئابووری ، کـــە **(ئیشوکارو سامانن)**٠ خۆبەستنەوە بەو دەستورانە گیروگـــرفت لەناو ئەبات ، بەڵام بە پێچەوانەوە ، واتە دوور کەوتنەوە لێیان وپشت گـوێ خستنیان گیروگرفت دروست ئەکات **(ولو ان اهل القری آمنوا واتقوا لفتحنا علیهم برکات من السماء والارض ولکن کذبوا فأخذناهم بما کانـــوا یکسبون)الاعراف٩٦**٠ واتە:ئەگەر خەڵکی گوندوشارەکان باوەڕ بە خوا بهێنن وە لێی بترسن،دەرگای خێرو فەڕیان لە ئاســــمانو زەویدا بۆ ئەکەینەوە ٠

---

(٢٥) ڕۆژنامەی (الثورة)ی عێراقی ژمارە ٢٩٥٤ بەرواری ١٤/٣/١٩٧٨٠

ئینجا لەبەر ئەوەی لە باسەکەمان دەرنەچین ، ئەگەڕێینەوە بۆ هۆکانی گیروگرفت ، کە بێدادی دابەش کردنو وە بەرنەهێنانی (عدم استثمار) تەواوی سروشتو سامانەکانیەتی - **(الله الذی خلق السموات والارض وانزل من السماء ماءً فاخرج به من الثمرات رزقاً لکم وسخر لکم الفلك لتجری فی البحر بامره وسخر لکم الانهار وسخر لکم الشمس والقمر دائبین وسخر لکم اللیل والنهار وآتاکم من کل ما سألتموه وان تعدوا نعمة الله لا تحصوها ان الانسان لظلوم کفار)** ابراهیم ٣٣ـ٣٤ ۰

واتە : ئەو خوایەی زەویو ئاسمانەکانی دروست کردووە ، لە ئاسمانەوە باران ئەبارێنێ ، وە بە باران میوەو ڕۆزیتان بۆ پەیدا ئەکات، کەشتی خستۆتە ژێر ڕکێفتانەوە کە بە فەرمانی ئەو ئەڕوات لە دەریادا، وە ڕووبارەکانی خستۆتە ژێر ڕکێفتانەوە،وە هەرچی داواتان کرد داویەتی پێتان ، ئەگەر ئێوە نیعمەتەکانی خوا بژمێرن ناتوانن هەمووی بژمێرن، بەڕاستی مرۆڤ ستەمکارو سوپاس ناپەزێرە ۰

## دەزگای دابەش کردن

لای ئابووری ناسە سەرمایەدارەکان دابەش کردن بریتیە لە دابەش کردنی سامانی بەرهەم هێنراو، یان داهاتی نەتەوە بەسەر دانە بەرهەم هێنەکاندا ، کە بریتین لە سەرمایەو ، زەویو سەرچاوە سروشتییەکانو ، ئیشوکارو ، ڕێکخستن ۰ ئەویش بە شێوەی سودو زەویانەو کرێو قازانج ۰

لەم ڕژێمەدا خەلکی سەربەستن ، کە دەست بگرن بەسەر سەرچاوە بەرهەم هێنەکاندا ۔ هەرکەسە بە پێی تواناو لێهاتوویی خۆی ، لە ژێر ناوی سەربەستی ئابووریدا ، کە هەمیشە لە خزمەت لێهاتوو و بەهێزەکاندایە،وە هۆیەکی سەرەکییە بۆ دەست گرتنیان بەسەر زۆربەی

سەرچاوەکانداو پەیدا بوونی دابڕکردنیش،مارکسیزمەکـانیش بە پێی بیروڕای خۆیان لە شی‌کردنەوەی مێژووی مرۆڤایەتی ، باوەڕیان وایە کە خاوەندارێتی دانە بەرهەم هێنەکان پەیوەندی‌یەکی ڕاستەو خۆی هەیە بە شێوەی بەرهەم هێنانەوە • واتە : هەر شێوەیەکی بەرهـــەم هێنان لــە قۆناغێکی مێژوویی‌دا ، ڕێگای دابەش کردنی سەرچاوەکـانی بەرهـــەم هێنانو جۆری ئەو کەسانەی ئەبنە خاوەنی،دیاری ئەکات•وە لەم دۆخەدا ئەمێنێتەوە تا مێژوو ئەچێتە قۆناغێکی ترەوە ، بەرهەم هێنان شێوەیەکی نوێ وەرئەگرێو ، تەنگ هەڵئەچنێ بە ڕژێمی دابەش کردنی کـۆن ، وە ئەبێتە کۆسپ لە ڕێگایدا تا لەناوی ئەبات ،پاش ناکۆکیەکی درێژخایەن، دابەش کردنی نوێی سەرچاوە بەرهەم هێنەکان دێتەکایەوە • کە ئەگونجێت لە گەڵ شێوەی بەرهەم هێناندا •

بەڵام ڕژێمی ئابووری ئیسلام،لە چارەسەری کێشەی دابەش کردندا بۆچوونێکی جیاوازو فراوانتری هەیە • تاگـونجێت لە گـــەڵ بیروڕای سەرمایەداری دەربارەی سەربەستی ئابووری • وە تەنها بەدابەش کردنی سامانی بەرهەم هێنراوەوە ناوەستێو،خۆی بدزێتەوە لە گرنگترین لایەنی دابەش کردن،کە دابەش کردنی سەر چاوەکانی بەرهەم هێنانە•هەروەها باوەڕی نیيە بە بوونی پەیوەندیەکی (حەتمی) لە نێوان خـاوەندارێتـــی دانە بەرهەم هێنەکانو شێوەی بەرهەم هێنان • بەڵکو دابەش کردن لای ئیسلام کێشەی مرۆڤە ، کە خاوەنی پێویستـــی‌و ئاواتو ئارەزووە • وە پێویستە بە دەستیان بهێنێو تێریان بکات ، بە شێوەیەك پارێزگـــاری ئادەمێتی مرۆڤ بکات • لەبەر ئەوە دانی ناوە بە خاوەندارێتی تایبەتی‌دا، بۆ تێرکردنی پێویستی‌یەکانی مرۆڤ ، وە دانی ناوە بە خاوەندارێتـــی گشتی‌دا ، بۆ تێرکردنی پێویستی‌یە گشتی‌یەکـانی کۆمەڵ ، هەروەهـــا خاوەندارێتی دەوڵەتیشی داناوە بۆ پارێزگـــاری ئەوانەی کـە ناتوانن

پێویستی‌یەکانیان بە دەست بهێنن ، لــە ڕێگای خاوەنداریێتــی تایبەتی‌و ئیشوکارەوە . بۆ هێنانەدی هاوسەنگی کۆمەڵایەتی‌و ، بڵاوکردنەوەی لــە کۆمەڵدا · ئەمە لە بارەی دابەش کردنی سەرچاوەکانی بەرهەم هێنانەوە، ئێستاش دێینە سەر دابەش کردنی بەرهەمی نەتەوە ـ داهاتی نەتەوە ـ بەسەر هەموو بەشەکانی کۆمەڵدا ·

لێرەدا بۆ ئاسانی ڕوون کردنەوەی باسەکــەمان ، کۆمەڵ دابەش ئەکەین بە سێ بەشەوە :

**یەکەم :** ئەوانــەی بە هۆی توانای ژیری‌و لەشی‌یــەوە ، ئەتوانن داهاتێکی بەرز بە دەست بهێنن . وە ژیانێکــی باش‌و خۆش گــوزەران بدەنەسەر ·

**دووهەم :** ئەوانەی کە چەند خەریکی ئیشوکارو هەوڵدانن ، تەنها ، ئەوەندەیان دەست ئەکەوێت ، ژیانێکی سادەو ناخۆش ئەدەنە سەر ·

**سێهەم :** ئەوانەی بە هۆی کەم‌و کوڕی ژیری یا لەشی‌یەوە، ناتوانن هیچ داهاتێک بە دەست بهێنن ، واتە پەك کەوتەن ·

دەزگای دابەش کردن لە ئیسلامدا ، لە دوو پایەی سەرەکــی پێك هاتووە :

کارو پێویستی · وا لە خوارەوە لــە بەر ڕۆشنایی ئەو بەشانەی کۆمەڵیان لێ پێك هاتووە شی‌یان ئەکەینەوە :

**١ ـ کارکردن :** بۆ ئەوەی دەوری کار بزانین لــە دابەش کردندا . پێویستە ئەو پەیوەندی‌یە بزانین لە نێوان کرێکارو ئەو سامانەدا ، کــە بە هۆی کارەوە بەرهەمی ئەهێنێ :

کۆمەنستەکان ڕایان وایە ، کرێکار هیچ مافێکی نییە وەری بگرێت، لە ئەنجامی ئەو کارەی ئەیکات ، تەنها تێرکردنی پێویستییەکانی نەبێ ، بە بێ گوێدانە چۆنیەتیو چەندایەتی ئەو نیشوکارەی کە پێی هەڵئەستێ . چونکە کار لای ئەوان،فەرمانبەرایەتیەکی کۆمەڵایەتییە کرێکار پێشکەشی ئەکات بە کۆمەڵ کۆمەڵیش بە تێرکردنی پێویستییەکانی پاداشتی ئەداتەوە . کۆمەڵ بە ڕای ئەوان بونێکی گرنگو سەرەکییە،مرۆڤ بەتەنها بە هیچ نە ئەژمێردرێت،چونکە لەو بوونە گەورەیەدا ئەتوێتەوە . لێرەدا، مرۆڤ کار بۆ کۆمەڵ ئەکات ، کۆمەڵیش ئەبێت بە خاوەنی ئەو سامانەی کە مرۆڤ بە دەستی ئەهێنێ . .

دابەش کردن لەم ڕژێمەدا ، لەسەر ئەم سەرەتایەی خوارەوە دابەش ئەکرێت :

(لە هەر کەسێکەوە بە پێی توانای، بۆ هەر کەسێك بە پێی پێویستیی) کەوابوو ، کار هیچ دەورێکی نییە لە دەزگای دابەش کردنی کۆمەنستیدا، بەڵکو دابەش کردن بە پێی پێویستی ئەکرێت . . واتە تاکە کەس هیچ مافێکی نییە لە ژیانی ئابووریدا ، جگە لە تێر کردنی پێویستییەکانی . هەر ئەمەشە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ لە کۆمەڵی کۆمەنستیدا،هیچ هاندەرێك نابێت هانی بدات ، بۆ زیاتر کردنو باشتر کردنی جۆری بەرهەمەکە . کەوابوو لە کۆمەڵی کۆمەنستیدا ، ئامرازی دابەش کردن تەنها پێویستییە .

سۆشیالیستە مارکسیەکانیش : پەیوەندی کرێکارو ئەنجامی کارەکەی لە ڕوانگەی تێگەیشتنی تایبەتییانەوە لە بارەی بەهاوە دیاری ئەکەن .

ئەوان ئەڵێن : کرێکار بەو کارەی ئەیکات ، بەها بۆ شتومەك دیاری ئەکات(٢٦) • لە بەر ئەوەی کار سەر چاوەی بەهایــــە ، ئەبێ دەزگــــای دابەش کردن لە سۆشیالیستیدا تەنها کار بێت ، وە لەسەر بناغەی ئــەم سەرەتایە بنیات بنرێت کە ئەڵێت :

(لە هەر کەسێکەوە بە بێی توانای ، بۆ هــەر کەسێك بــــە پێی کاری) کەوابوو هەموو کەسێك بۆی هەیە بە پێی ئەو وتەیەی ســەرەوە ئەنجامی کاری خۆی بەدەست بهێنێ •

لێرەدا بەشی یەکەمی کۆمەڵ کەلە پێشەوە دیاریمان کرد ـ ژیانێکی خۆش گوزەرانو باش ئەباتە سەر • بەشی دوو هەمیش بە کولەمەرگــی ژیان ئەباتە سەر ، وە ئەبێ بە سنگێکی فراوانەوە ئەو جیاوازییە پەسەند بکات کە لە نێوان ئەوانو بەشی یەکەمدا هەیە • چونکە هــەر کــەســە بە پێی تواناو ئیشوکاری خۆی بەشی ئەدرێت(٢٧) •

بەڵام بەشی سێهەم لە کۆمەڵ ، کە بە هۆی کــەمو کوڕی ژیری یا لەشییەوە ، ناتوانن ئیشوکار بکەن ، وە هیچ داهاتێك بە دەست بهێنن، لە بەر ڕۆشنایی ئەو سەرەتایانەی لە پێشەوە وتمان ، وە لەبەر ڕۆشنایی دروشمەکانیان وەکو (هەرکەس کار نەکات نان ناخوات) بێگــومان ئەبێ دەست بەرداری ژیان ببن •

دکتور مستەفا سباعي لە کتێبی **(اشتراکیة الاسلام)دا** لــە لاپەڕە هەشتا ئەڵێ : بە چاوی خۆمان دیمان لە یەکیەتی سوڤیەت کە دەوڵەتــی سەرەکی سۆشیالیستییە ، چەند جیاوازییەکی گــەورە هەیە لە نێوان ئاستی ژیانو داهاتی بەشەکانی گەلانی سۆڤیەتدا ، هــەر لــە داهاتی

---

(٢٦) الموجز في الاقتصاد السياسي/ل١٠ • ليونتيف/ ترجمة : ابو بكـر يوسف ص٢٩ •

(٢٧) لێرەدا ئێمە بەپێی بیردۆزەو دروشمەکانیان قسە ئەکەین •

کرێکارێکەوە کە ٤٥ ڕۆبلە ، بۆ داهاتی مامۆستایەکی زانکۆ کە د هاتــــی ١٥٠٠ ڕۆبلە وە لە هاوولاتیەکی ئاسایی‌یەوە ، کـــە لە ژوورێکی بچوکـــی ناخۆشدا ئەژی ، بۆ فەرمانبەرێکی گـــەورە ، یان کاربەدەستێکــــی پارتی کۆمەنست، کە لە کۆشکێکی گەورەو خۆشدا ئەژی‌و ئوتومبیلێکی تایبەتیشی لە ژێردایە ٠

هەروەها دکتۆر سباعي لە هەمان سەرچـاوەدا ئەڵی : بە چـــاوی خۆمان دیمان سوالکەرەکان لەبەر دەرگای مزگەوتەکاندا لە ناو جەرگــەی شاری مۆسکۆدا ، دەست پان ئەکەنەوە بۆ خەڵکی کە خێریان پێ‌بکەن ٠

## کار لە ڕوانگەی ئیسلامەوە :

بەڵام کار لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ڕێگایە بۆ بە خاوەن بوونی کرێکار لە ئەنجامی کارەکەی ، یان بە شێوەیەکی‌تر بڵێین : خاوەندارێتی تایبەتی لە ڕژێمی ئیسلامدا لەسەر بناغەی کار پەیدا ئەبێت ٠ لێرەدا خاوەندارێتی تایبەتی مافێکی سروشتی‌و ڕەوایەتی ٠ کەوابوو کار لە ئیسلامدا ئامێرێکی سەرەکی‌یە لە دەزگای دابەش کردندا ٠ نەك هۆیەکـی سەرەکـــی بێت بۆ بەهای شتومەك‌و ئەنجامی ئەو کارە ٠ هەروەها کــار تەنها ئامێری دابەش کردن نییە لە ئیسلامدا ، بەڵکو شان بەشانی کـــار ، پێویستی ئامێرێکی گرنگە ، وە هەر یەکەیان تەواوکەری ئەوی تریانن ، بۆ هێنانەدی دادگەری کۆمەڵایەتی لە ژیانی مرۆڤایەتی‌دا ، کە هەر خـــاوەن مافێ ، مافی خـــۆی بدرێتێ ، نەك وەکو ڕژێمە مرۆڤ کردەکـــان لە لایەك تاك بدرێت بەسەر کۆمەڵداو ، لە لایەکـی‌تر کۆمەڵ بدرێت بەسەر تاکـــدا ، وە یان چینێك بدرێت بەسەر چینەکانی تردا ٠

**٢ - پێویستی :**

ئامێری دووهەم لە دەزگای دابەش کردن لە ئیسلامدا پێویستی‌یە، بەڵام پێش ئەوەی باسی پێویستی لە ڕێبازی ئیسلامدا بکەین ، با بزانین بیروڕای ڕێبازەکانی‌تر چی‌یە:

ـ کۆمەنستەکان وەکو لە باسی کاردا وتمان ، دەزگـای دابـــەش کردنیان تەنها لە پێویستی پێك هاتووە ، ئیتر گـوێ نادەن بە هیـــچ ئامێرێکی تر بە پێی بیردۆزەی (لە هــەر کەسێکەوە بە پێی توانای ، بۆ هەر یەکێك بە پێی پێویستی) بێ‌گومان ئەم دابەش کردنە لەبەر ئەوەی هاندەرێکی خودی نییە هانی مرۆڤ بدات بۆ تێکۆشان لە پێنـــاوی‌دا ، ئەبێتە هۆی نەبوونی ملەملێ کە هۆیەکە بۆ پێشکەوتنی ئابووری .

ـ سۆشیالیستە مارکسیەکانیش ـ ئەوانەی ناوی سۆشیالیستی زانستی‌یان لە خۆیان ناوە ـ دەزگای دابەش کردنیان تەنها لەسەر بناغەی کارە ، ئەویش بە پێی (لە هەر کەسێکەوە بـە پێی توانای ، بۆ هــەر کەسێك بە پێی کاری) ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ ، هــەر کەسە بـە پێی کاری خۆی داهات بـە دەســت ئەهێنێ وە لەبــەر ڕۆشنایی بەشــەکانی کۆمەڵدا ـ کە لە پێشەوە دیاریمان کرد ـ بەشی یەکـەم داهاتی بـەرز بەدەست ئەهێنێ‌و ، خۆش گوزەران ئەژی . بەشی دووهەمیش داهاتێکی کەم بـەدەست ئەهێنێ‌و ژیانیان خۆش نابێ . بـەڵام بەشی سێ‌هەم کـە بەپێی تێگەیشتنی مارکسایەتی دەربارەی ناکۆکی چینایەتی-کە ناکۆکی نێوان چینی کرێکارو چینی سەرمایەدارە-نە لە چینی کرێکارە،وە نە لە چینی سەرمایەدارە .. چونکە بە هۆی کەمی کوڕی ژیری،یا نەخۆشی‌یەوە ، ناتوانێ ئیشوکار بکات،وە هیچ سەرمایەشی نییە ،کەوابوو ئەبێ دەست بەرداری ژیان ببێ ، چونکە دابەش کردنی مارکسایەتی لەسەر چاوەیەکی

ڕەوشتی‌یەوە نەهاتووە ، بەڵکو لــە سەرچاوەی ناکۆکی چینایــەتی‌یەوە هاتووە !!

## لە ڕژێمی سەرمایەداری‌دا :

پێویستی لە ڕوانگەی سەرمایەداری‌یەوە ، بە تەواوی بەشێك لــە کۆمەڵ کە چینی کرێکارە بەرەو برسێتی‌و ڕەجاڵی ئەبات ، چونکە سەرمایە دارەکان‌دەزگای دابەش کردنیان لەسەر بناغــەی ڕژێمی بازاڕو پرۆژەی سەربەست دامەزراوە۰وە هەموو شتێ لای ئەوان،وەکو شمەك،خواستو خستنەڕوو لە بازاڕدا بەهای بۆ دیاری ئەکات ۰ کەوابوو پێویستی چەند پتربێت لە کۆمەڵی سەرمایەداری‌دا،ئەوەندە هێزی کارکردن لــە بازاڕدا خستنەڕووی پتر ئەبێت ، ئەمەش ئــەبێتە هۆی دەرچوونی زۆریان لــە مەیدانی کارو دابەش کردندا،وە زۆر بوونــی خستنە ڕووی کار ئەبێتە هۆی پەیدا بوونی بێکاری لە کۆمەڵدا۰وە بێکاریش لە دەزگای دابەش کردنی سەرمایەداری‌دا هیچ بەشێکی نییە ، واتە هــەمان دەست بەردار بوونی ژیان چاوەڕێی ئەکات ۰

کەوابوو پێویستی لە ڕژێمی سەرمایەداری‌دا ، بریتی‌یە لە چوونە دەرەوەی کۆمەڵە کەسێك لە دەزگای دابەش کردن ، نــەك ئامێرێك بێت لەو دەزگایە! ئەمەو بە دەیان هۆی تریش ، وڵاتە سەرمایەدارەکانی کردۆتە مەیدانی خراپەکاری‌و، بــەدڕەفتاری‌و، دزی‌و، جەردەیی‌و ، خۆکوشتن‌و ، خۆفرۆشتن‌و ، دروست بوونی دەیان ڕێکخراوی وێرانکاری،کە هــەموو ئەو وڵاتانەی گرتۆتەوەو پێوەی ئەتلێنەوە ۰ بۆ نمونە سەرژمێری‌یەك لە واشنتۆن لــەم ساڵانــەی پێشوودا بڵاوکرایەوە ، ڕوونی کردۆتــەوە کــە تێکڕایی کوشتن لە ڕۆژێکدا ، لە وڵاتــە یەکگرتووەکانی ئــەمریکا (٣٢)

کەسە ، وە بەم پێیە لەو ساڵەدا (١٢) هەزار کەس کوژراوە لەو وڵاتەدا(٢٨) ٠

**پێویستی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە :**

دەزگای دابەش کردن لە ئیسلامدا نە لەسەر بناغەی ناکۆکی چینایەتی دامەزراوە ، وەکو ڕژێمە مارکسیستەکان ،وە نە لەسەر بناغەی ڕژێمی بازاڕو پرۆژەی سەربەست وەکو ڕژێمە سەرمایەدارەکان بەڵکو لەسەر بناغەیەکی ڕەوشتی نەگۆڕو پێك هێنانی کۆمەڵێکی بەختیار دامەزراوە ، کە هەموو وەك برا ژیانێکی کامەران بەدەنە سەر٠ هەروەکو پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی: «باوەڕی نابێت هەرکەسێك ،تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە، بۆ براکەشی پێی خۆش بێت» هەروەها فەرموویەتی: (موسڵمانان وەکو یەك لەش وان ، ئەگەر بەشێکی ئەو لەشە ئازاری هەبوو ، هەموو لەشی تا دای ئەگرێ‌و شەونخونی ئەکێشێ) ٠

لەبەر ئەوە هەروەکو ئیشوکار ئامێرێکی گرنگە لە دەزگای دابەش کردندا ، پێوستیش لە هەمان کاتا ئامێرێکی گرنگە لەو دەزگایەدا ٠ بەڵکو هەریەکەیان تەواوکەری ئەوی تریانن، بۆ گەیشتنی کۆمەڵ بەدادگەری کۆمەڵایەتی‌و بێبەش نەبوونی هیچ کەسێك ، یا هیچ چینێك ٠

بەم شێوەیە بەشی یەکەم لە کۆمەڵ ـ کە بەپێی توانای ئیشوکاریان ئەتوانن داهاتێکی بەرز بە دەست بهێنن ـ بە هیچ جۆرێ ڕێگایان لێ ناگیرێت بە مەرجێك ئەو ڕێگایانەی ئەیگرنەبەر بەپێی دەستوورەکانی ئیسلام ڕەوا بێت ٠

---

(٢٨) ڕۆژنامەی «الثورە»ی عێراقی ژمارە ٣٠٦٠ بەرداری ١٦/٧/١٩٧٨٠

بەلأم بەشی دووەمم کە ڕادەیەکی نزم لە داهات بەدەست ئەهێنێو ، باری ژیانی خۆش نییــە ، ئامێری پێویستی دەورێکی گرنگی هــەیە بۆ گەیاندنی ئەم بەشە بە ژیانێکی خۆش گوزەرانو، بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانیان • هەروەها بەشی سێهەم کە نە لە کۆمەنستیو سۆشیالیستیدا، وە نە لە سەرمایەداریدا هیچ پشکێکی نییە، لە ڕژێمی ئیسلامدا پشکێکی گرنگو سەرەکی هەیە بۆ ژیاندنیو ، گەیاندنی بە ئاستێك کە شیاوی مرۆڤێکی خاوەن هەستو سۆزی ئادەمێتی بێت ،وە کەرامەتی بپارێزرێ• ئەو پشکەیش پێویستییە، هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

**(وفي اموالهم حق للسائل والمحروم) الذاريات/١٩ •**

واتە : لە سامانەکانیاندا ، مافی سوالکەرو نەداران هەیە •

**(والذين في اموالهم حق معلوم ، للسائل والمحروم) المعارج ٢٤_٢٥**

واتە : ئەوانەی کــە لــە سامانەکانیاندا ، مــافی دیــاری کراوی سوالکەرو نەداران هــەیــە • پێغەمبــەر (د•خ) فەرموویەتی : «خــەلکی هەرگەڕەکێك برسییەکیان تێدابوو ، تێریان نەکرد ، واتە چارەسەری کێشەکەیان نەکرد _ بەرین لە خوا وکۆمەکی خوا» بەلێ ڕژێمی ئیســلام هیچ کەلێنێکی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا نەهێلاوەتەوە تەگبیری بۆ نەکردبێو چارەسەری دادگەرانەی بۆ دانەنابێت •

## خاوەنداریتی :

خاوەنداریتی پێناســە ئەکرێت : (بە مــافی کــەلك لێوەرگرتنو دەستکاری کردنی شمەك بە شێوەیەکی بێسنور (مطلق) • بــەلأم بەو مەرجەی بە شێوەیەك بەکارنەهێنرێ کە یاساو ڕژێم پەسەندی نەکات ، هەروەها ڕوسکین پێناسەی ئەکات بە : مافی دەست بەسەرا گرتنی ئەو

سامانەی بە ڕێگایەکی ڕەواو ئابڕومەند بە دەست دێت ، وە بەکارهێنانی بەوریایی‌و کارامەیی)(٢٩)

## خاوەندارێتی لە ئیسلامدا :

ڕێبازی ئابووری ئیسلام ڕێبازێکی سەربەخۆو ڕەسەنە ، لە سەرەتای پەیدا بوونی‌یەوە دانی ناوە بەچەند جۆرێك لە خاوەندارێتی ٠ نەك وەکو ڕێبازی سەرمایەداری کە لەسەر بناغەی خاوەندارێتی تایبەتی داڕژاوە . تەنها باوەڕی هەیە بەو جۆرە خاوەندارێتی‌یە ، لە هەموو جۆرە سامانێکدا ٠ بەلام تاقی‌کردنەوەکانی مێژوو ئەوەی بۆ دەرخستن کە ڕێبازەکەیان لە گەل سروشتی مرۆڤ‌و پێشکەوتنی باری کۆمەلایەتی‌دا ناگونجێ، وە ناتوانێ دەوری خۆی بەو شێوەیە بەرێتە سەر ٠ بەلکو گیروگرفتی ئابووری زیاتر بەرەو ئالۆزی ئەبات‌و ، مرۆڤایەتیش بەرەو سەر لێ‌شێوانێکی گەورەی کۆمەلایەتی ٠

لەبەر ئەوە ناچار بوون دان بنێن بە خۆمالی کردن ـ میللی کردن ـی چەند بەرژەوەندیەکی گەورەو گشتی‌دا ، وەکو ئێستا لە ولاتە سەرمایەدارەکاندا دەستیان داوەتێ٠ بەلام ئەم جۆرە خاوەندارێتی‌یە شێوەیەکی فراوانی وەرنەگرتووە ، بەلکو بەپێی پێویستی‌و ناچار بوونیانە ٠

هەروەها ڕێبازی ئیسلام وەکو ڕێبازی سۆشیالیستی نییە خاوەندارێتی کشتی بناغەی ڕێبازەکەیەتی‌و ، لە سەری داڕژاوە . وە بە هەمان شێوە ئەمانیش لە ژێر پالە پەستۆی ڕووداوەکانی مێژوو و

---

(٢٩) التوزیع/دکتور محمد عزیز محمد لاپەڕە/٧ ٠

سروشتی مرۆڤدا، ناچار بوون زۆر یا کەم دانبنێن بە خاوەندارێتی تایبەتیدا ، شان بەشانی خاوەندارێتی گشتی ٠ بەلام لێرەشدا خاوەندارێتی تایبەتی جۆرێکی سەرەکیو فراوان نییە . بەلکو هەمان دەستوور سەرنەکەوتنی ڕێبازەکەیان لە چارەسەرکردنی گیروگرفتی ئابووریو کۆمەلایەتیدا ، ناچاری کردوون دانبنێن بە خاوەندارێتی تایبەتیدا لە شێوەیەکی تەسکو سنووردااردا ٠

بەلام ڕژێمی ئیسلام هەر لە سەرەتای سەرهەلدانیەوە ، لەسەر چەند جۆرێك خاوەندارێتی ڕێبازی خۆی داڕشتووە ، ئەوانیش : خاوەندارێتی تایبەتی ، خاوەندارێتی گشتی ، خاوەندارێتی دەولەت ٠

سەرنەکەوتنی دوو ڕژێمەکەی پێشوو ، لە تاقی کردنەوە مێژوویی یەکەیاندا سەلماندوویەتی ، کە ڕێبازی ئیسلام لەبارترین ڕێبازە لە گەل سروشتی مرۆڤو گەشەکردنی کۆمەلایەتیدا ئەگونجێ ، چونکە ئەو دوو ڕژێمەی کە باسمان کردن ، هەردوکیان ناچار بوون دابەزن لە زۆر خالی بنەڕەتی بیردۆزەکانیان ، وە د ن بنێن بە شێوەیەکی جیاواز لە شێوە سەرەکیو ڕەسەنەکانیان ، لە ژێر پالە پەستۆی پێویستی مرۆڤایەتیو سروشتو فیطرەی مرۆڤو گەشەکردنی کۆمەلدا ٠ هەرچەندە ئەو دان پیانانەیان ناگونجێ لە گەل سەرەتا بیردۆزەیی یەکانیاندا ٠

بوونی چەند جۆرێك خاوەندارێتی لە ئیسلامدا ، وای لە زۆر لە نەشارەزایان لە ڕژێمی ئیسلام کردووە کە بلێن : ئابووری ئیسلام تێکەلێکە لە ئابووری ڕژێمی سەرمایەداریو سوشیالیستی ، بەبێ ئەوەی بیرلەوە بکەنەوە کە ڕژێمی ئیسلام بە سەدان سال لە پێش پەیدا بوونی

بوونی ئەواندا پەیدا بووە ، وە لە سەرەتای مێژووی پەیدا بوونیشیەوە ئەو جۆرە خاوەندارێتیانەی لە سەردەمی فەرمانڕەواییدا جێبەجێ کردووەو سەرکەوتنیشی بە دەست هێناوە،سەرکەوتنێك،لە مێژووی مرۆڤایەتیدا یەکەم تاقی کردنەوەیە ، کە تا ئێستاش هیچ ڕژێمێکی تر،نەیتوانیوە ئەو سەرکەوتنە بە دەست بهێنێ ٠

مێژوو بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرامان ئەداتێ لەسەر ڕژێمی ئیسلام کە توانیویەتی گیروگرفتی ئابووری چارەسەر بکات لە سەردەمی فەرمانڕەواییدا ، بە شێوەیەك کە هەژاری بنەبڕ بکات ، وە هەموو هاو ولاتیانی ولاتی ئیسلام لە هەژاری‌و ترس‌و لەرز ڕزگار بکات٠ هەروەکو لە سەردەمی عومەری کوری عەبدول عەزیزدا ، فەرمانبەرانی کۆکردنەوەی زەکات لە کاتێکا زەکاتی ئەفریقایان کۆکردبووەوە ، کەس دەست نەکەوتبوو هەژار بێت‌و زەکاتەکەیان لێوەربگرێت ، لەبەر ئەوە بەو زەکاتە کۆیلەیان لە ولاتانی دراوسێیان ئەکری‌و ئازادیان ئەکرد ٠

وە هەر لەو سەردەمەدا ، هەموو ڕۆژێ جارچی ئەگەڕاو هاواری ئەکرد کوان هەژارەکان ؟ کوان قەرزارەکان ؟ کوان ئەوانەی ژن‌و شوویان ئەوێت ؟ کوان هەتیوەکان ٠ بۆ ئەوەی چارە سەری کێشەکانیان بکەن٠ بێگومان ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ،کەس نەبووە زەکاتیان لێوەربگرێت، وە دەولەت لەو کاتەدا خۆی گەڕاوە بە دوای هەژارو کەم دەرامەتاندا تا یارمەتیان بداو، چارە سەری گیرو گرفتەکانیان بکات !٠

بەلام ئێستا لە سەردەمی سەرمایەداری‌و سۆشیالیستی هاو چەرخدا، لە گەل ئەو هەموو پێشکەوتنە زانستیانەی لە بواری پیشەسازی‌و کشتوکال‌و تەکنولۆژیاو٠٠هتد٠٠ ڕووی داوە،وە شانازی پێوە ئەکەن نەیانتوانیوە چارەسەری کوێرەوەری‌و ترس‌و لەرزی ژیان بکەن ، لە پێشکەوتووترین دەولەتی ئەم سەردەمەدا ٠

# جۆرەکانی خاوەندارێتی لە ئیسلامدا

ڕژێمی ئابووری ئیسلام دانی ناوە بە سێ جۆر خاوەندارێتیدا : خاوەندارێتی تایبەتی (تاکەکەس)و ، خاوەندارێتی گشتیو ، خاوەندارێتی دەوڵەت . هەر چەندە زۆر لە ئابووری ناسەکانی ئیسلام خاوەندارێتی لە ئیسلامدا ئەکەن بە دوو بەشەوە ، ئەوانیش خاوەندارێتی تایبەتیو خاوەندارێتی گشتی ، لێرەدا ئەوان خاوەندارێتی گشتیو خاوەندارێتی دەوڵەتیان بەیەکەوە بەستووە . هەندێکی تر لە زانایان ئەیکەن بە سێ بەشەوە، بە جیاکردنەوەی خاوەندارێتی گشتیو خاوەندارێتی دەوڵەت(٣٠) . ئێمەیش لەسەر بیروڕای ئەمانین ، چونکە تا ڕادەیەك جیاوازی هەیە لە نێوان ئەو دوو خاوەندارییەدا ، وەکو لە دواییدا بۆت ڕوون ئەبێتەوە . هەر چەندە هەردوولایان مەبەستیان تێرکردنی زۆربەی خەلکیو هێنانەدی هاوسەنگیو دادگەری کۆمەڵایەتییە. لەبەر ئەوە ئێمەش خاوەندارێتی لە ئیسلامدا ئەکەین بەسێ بەشەوە . وا لە خوارەوە ئەوەندەی کە ماوەی ئەم باسە سەرەتاییە بێت ، لەسەر هەریەکەیان ئەدوێین :

### ١ ـ خاوەندارێتی تایبەتی (تاکە کەس) :

### سروشتی خاوەندارێتی تایبەتی لە ئیسلامدا .

ڕژێمی ئیسلام مافی خاوەندارێتی تایبەتی داوە بە مرۆڤ ، بەلام مافێکی بێسنورو بەرەلای نەداوەتێ ، تا بە ئارەزووی خۆی ـ وەکو سەرمایەداری ـ بەکاری بهێنێ بۆ سوودی خۆی ، بەبێ گوێ دانە سوودی کۆمەڵ بە گشتی، وە ئەو دەورەی کە ئەم خاوەندارییە دراویەتێ

---

(٣٠) وەکو دکتوز احمد النجار لە کتێبی (المدخل الی النظریة الاقتصادیة)دا وە چەند کەسێکی تر .

لە ژیانی ئابووری‌دا • بەڵکو ئیسلام شان بەشانی ئەم مافە چەند مەرجێکی بۆ داناوە ، وە ئاراستە ئەکرێت بۆ گونجاندنی بەرژەوەندی تایبەتی لە گەڵ بەرژەوەندی کۆمەڵدا • هەروەها هۆو ڕێگاکانی بە دەست هێنانی‌و شێوەی بەکارهێنانی‌و پەرەپێدانی•• هەمووی دیاری کراوە لەسەر بناغەیەکی بەرزی ڕەوشتی بۆ ژیانی مرۆڤایەتی ، کە ببێتە هۆیەك لە هۆکانی دادگەری کۆمەڵایەتی ،وەکو لەم ڕێبازانەی خوارەوەدا دەرئەکەوێت :

**یەکەم: هەموو شتێ لەم جیهانەدا هی خوایەو کۆمەڵیش جێگریەتی:**

ڕێبازی یەکەم کەشان بەشانی خاوەندارێتی بڕیاری لەسەر دراوە ، مرۆڤ وەکو جێگری کۆمەڵ وایە لەو خاوەنداری‌یەی بە دەستیەوە‌یە، ئەو خاوەنداری‌یە شێوەی فەرمانبەرێتی‌یەکی کۆمەڵایەتی وەرئەگرێت ، زیاتر لە خاوەنداری‌یەکی بەرەڵا ، چونکە سامان بەگشتی مافی کۆمەڵەو، کۆمەڵیش جێگری خوای گەورەیە **(هو الذی جعلكم خلائف فی الارض)الفاطر/٣٩** •

واتە : خوا ئێوەی کردووە بە جێگر لە زەوی‌دا • **(واذ قال ربك للملائكه انی جاعل فی الارض خليفة) البقرة/٣٠** • واتە خوای گەورە بە فریشتەکانی وت : من جێگرم لە زەوی‌دا داناوە •

خاوەندارێتی تایبەتی لە ئەنجامی هەوڵ‌و تێکۆشانی مرۆڤەوە پەیدا ئەبێت • واتە:کارکردن بۆ بەدەست هێنانی بەشێك لەو سامانەی خوای گەورە بەخشیویەتی بە کۆمەڵ ؛ چونکە لە بنەڕەتا هەموو شتێ لەم جیهانەداهی خوای‌گەورەیە، ئەو کۆمەڵی‌بۆ دەستکاری‌و کەڵك لێ‌وەرگرتن کردووە بە جێگری خۆی **(لله ما فی السموات وما فی الارض) البقرة/٢٨٤**

واته : هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە هی خوایە · ئینجا هەر کەسە بە پێی تواناو پێویستی خۆی بەشی خۆی بە دەست ئەهێنێ·

لێرەدا گێڕانەوەی هەموو سامانێك بۆ خوای گەورە ، چەند ئەنجامێکی گرنگی هەیە وەکو :

١ ـ خەڵکی هەموو یەکسانن لە کەڵك وەرگرتنو دەستکاری هەموو سامانێك ، چونکە ئەم ئایەتە پیرۆزە **(وسخر لكم ما في السموات وما في الارض جميعاً منه)الجاثية/١٣** بەرەو ڕووی کۆمەڵ ووتراوە نەك تاکە کەسێك ، وەیان چینێك لە کۆمەڵ ·

٢ ـ ئەوە نامێنێ بۆ شانازی کردن بەو سامانەوە · چونکە سامانی خوای گەورەیەو بەخشیویەتی بە کۆمەڵ هەمووی ، وە مرۆڤیش وەکو فەرمانبەرێکی کۆمەڵ وایە لەو سامانەدا · لەبەر ئەوە ماوەی ئەوە نییە شانازی بکات ، وەیان ئەو سامانەی بەکاربهێنێ بۆ زیان گەیاندنو چەوساندنەوەی کەسانیتر · نرخی مرۆڤ لە کۆمەڵگای ئیسلامدا بە سامانو دەوڵەمەندی ناپێورێ ، بەڵکو بە چاکە کردنو جێبەجێ کردنی فەرمانو دەستورەکانی ئیسلامە **(ان اكرمكم عند الله أتقاكم)الحجرات/١٣**

واتە : چاکترینتان لای خوا ئەوەیە زیاتر فەرمانەکانی خوا بەجێ بهێنێ ·

٣ ـ هەستێکی وا لە مرۆڤدا دروست ئەکات . بەسنگێکی فراوانەوە مل کەچ ئەکات بۆ ئەو فەرمانو دەستورانەی دانراوە بۆ سامانو داراییو شێوەی بەکارهێنانیو پەرە پێدانیو ئەو ئەرکو باجانەی دانراوە لە سەریان ·

بەبێ دواکەوتن جێبەجێیان ئەکات ، بەبێ ئەوەی بەزۆرو ستەمی بزانێ · وەیان پێی ناخۆش بێت ، چونکە ئەوکەسە ئەزانێ سامان هی

حوایەو پێویستە لە ڕێگای خوادا ڕێژەیەکی لێ خەرج بکرێت ، وە هەر ئەو هەستەیە کە تا ئێستاش لەم سەردەمەی ئێستادا ، زۆر لە موسڵمانان زەکاتو چەندین جۆری‌تر لەو ئەرکانەی ئیسلام دایناوە جێبەجێی ئەکەن • وە یارمەتی هەژارانو نەداران ئەدەن ، لە پاش سەدان ساڵ دوورکەوتنەوە لە ڕژێمو فەرمانڕەوایی ئیسلام • وە تەنها هەستێکی خودییە کە لە ناخی مرۆڤی موسڵماندا چەسپیوە ، وە ئێستاش لە دڵی زۆر لە موسڵماناندا بڵێسەی ماوەو ، هانیان ئەدات بۆ بەجێ هێنانی ئەرکەکانی سەرشانیان بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك ، وە یا هیچ ڕژێمو یاسایەکی ئێستا داوای لێ بکات،چونکە ئایینی ئیسلام مرۆڤ بە شێوەیەك پەروەردە ئەکات کە واز لە هەندێ سەربەستیو سوودی تایبەتی خۆی بهێنێ لە پێناوی کۆمەڵدا بەبێ ئەوەی هەست بە کەمو کوڕی بکات لە ژیانیا ؛ چونکە ئەو هەستە پیرۆزەیە لە ناخی دەروونیدا چەسپیوەو بەو شێوەیە ڕەفتاری پێ ئەکات ، بۆ ئەوەی لە دەستوورو فەرمانەکانی ئیسلام دەرنەچێت تا بەڕاستی موسڵمان بێتەو ، توێشەی ئەو دنیا لە گەڵ خۆی هەڵ بکرێ •

**دووەم : کەڵك وەرگرتنو دەستکاری نەك تەنها دابڕین :ـ**

هەروەها خاوەندارێتی تایبەتی ، خاوەندارێتی دەستکاریو کەڵك وەرگرتن لەو سامانەیە نەك تەنها دابڕکردنی لە کۆمەڵ ، چونکە ئەگەر بەنەزانیو گەوجی دەستکاری ئەو سامانە بکات ، بە شێوەیەك کە زیان بگەیەنێ بە یەکێکی تر ، یان بە کۆمەڵ وە یان بە خۆی ، کۆمەڵ بۆی هەیە دەست بگرێت بەسەر سامانەکەیدا ، چونکە مافی خاوەندارێتی بەستراوە بە چاکیو ژیری دەستکاریو کەڵك وەرگرتن لەو سامانە :

**(ولا تؤتوا السفهاء اموالكم التي جعل الله لكم قياماً) النساء/ه**

واته : سامانی خۆتان مەدەن بە دەستی ئەو گێلانەی نازانن چـۆن سوودی لێ وەربگرن ٠

ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە لە ڕژێمی ئیسلامدا،چونکە سامان لە وڵاتی ئیسلامدا ، بە پێی ئەو سەرەتایە بە فێڕۆ ناڕوات ، وە جێگای تایبەتـی خۆی ئەگرێت ، ئەمیش هۆیەکی گرنگە بۆ پەرەسەندنی سامانی نەتەوە ٠

**سێهـەم :** ڕێگانەدان بە کۆبوونەوەی سامان لای ژمارەیەکـــی کـــەم لەخەڵکی :

ڕێگە نەدان بە کۆبوونەوەی سامانو دابڕکردنی لە کۆمەڵ لە لایەن ژمارەیەکی کەم لە دەولەمەندان **(کی لا یکون دُولة بین الاغنیاء منکم )** الحشر/٧ واتە : بۆ ئەوەی سامان تەنها لە نێوان دەولەمەندەکاندا ئاڵـو گۆڕی پێنەکرێت ، وە هەژاران بێبەش بن لێی ٠٠ وەکو ئێستا لە وڵاتە سەرمایە دارەکاندا خاوەنی سەرمایە گەورەکان بە ئارەزووی خۆیانو بە پێی بەرژەوەندی تایبەتی‌یان ڕامیاری ئەو وڵاتەو ، کـاروباری ناوخۆو دەرەوەی وڵاتەکەش دیاری ئەکەن ٠ هەر ئەمەشە ئەبێتە هــۆی دروست بوونی دابڕکردن (احتکار) لە وڵاتەکاندا کە بارێکی زۆر زیان بەخشـــو نالەبارە لە ژیانی ئابووری هەموو وڵاتێکا ، وە بەردی بناغـــەی دروست بوونی سەرمایەداری‌یە ٠

بۆ بەرگری لەو بارە نالەبارە ، ڕژێمی ئیسلام ڕێژەیەك لەو ســامانە وەرئەگرێتەوە لە خاوەن سامانەکانوخەرج ئەکرێت لە سوودی هەژارانو بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکاندا ، وە بۆ کەم کردنەوەی جیاوازی چینایەتی‌و نزیك کردنەوەیان لە یەکتری بەکار ئەهێنرێت ٠

ڕوداێکی گرنگ لە مێژووی ئابووری ئیسلامدا ئەو ڕێبازەی(مبدأ) سەئاندووە ئەویش ئەوەیە : لــــە کاتێکـا پێغەمبەرو (د٠خ) هـاوڕێ

موسڵمانەکانی کۆچیان کرد لە مەکەوە بۆ شاری مەدینە بۆ ڕزگار بوونیان لە ستەمو چەوساندنەوەی قورەیشەکان، بێگومان بە سەڵتی (تەنهـــا خۆیان) کۆچیان کرد چونکە نەیانتوانی بە ئاشکرا لەناو مەکەدا باربکەن، بەڵام کە گەیشتە مەدینە ، خەڵکی ئەو شارە یارمەتیو کۆمەکێکی گەورەو بێ وێنەیان پێکردن ، کە گەورەترین کۆمەکە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ،کە بگاتە ئەو ڕادەیەی بیروباوەڕ ئەوەندە کار بکاتە سەر مرۆڤ،هــەموویان بکات بەبرا بەدڵو بە گیانو ، بە کردەوەش برایەتی خۆیان بسەلمێنن ٠

بەڵێ خەڵکی مەدینە تێکڕا کۆچەرەکانی مەکەیان کرد بە هاوبەشی ژیانی خۆیان ، لە هەموو سامانو پێویستییەکی ژیاندا ، وە بە ئارەزووی دڵی خۆیان بەبێ ئەوەی دەسەڵاتێك زۆریان لێ بکات ٠

بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا جیاوازی مابوو لە نێوان خەڵکـــی مەدینەو کۆچەرەکانی مەکەدا ،لەبەر ئەوە کاتێ کە هۆزی بەنی نەزیر خۆیان دا بە دەستەوە ، ئەو سامانو دەستکەو تانەی کە دەست موسڵمانەکان کەوتبوو لەو ڕووداوەدا، پێغەمبەر (د٠خ) دابەشی کرد بەسەر هەموو کۆچەرەکاندا، وە تەنها دوو کەسی خەڵکی مەدینەی لەو دەستکەوتەدا بەشدار کــرد ، چونکە ئەوانیش وەکو کۆچەرەکان هەژار بوون ٠ لەبەر ئەوە تا ڕادەیەك جیاوازی نێوانیان کەم بووەوەو هەژارەکان ئاستی ژیانان بەرز بوویەوە٠

**چوارەم** : دانانی سنوری کاتی بۆ خاوەندارێتی تایبەتی :

دانانی سنووری کاتی بۆ خـــاوەندارێتی تایبەتیو ، بەستنــەوەی بەژیانی خاوەنەکەیەوە ، واتە خاوەندارێتی تایبەتی ئەبڕێتەوە بە کۆتایی هاتنی ژیانی خاوەنەکەی واتە : مردنی ؛ چونکە هەڵو مەرجـی کـەڵك وەرگرتنو بەردەوامی کەڵك وەرگـــرتن ، کـــە دوو هۆی سەرەکین بۆ

خاوەندارێتی ، بە مردنی خاوەنەکەی کۆتایی دێت • لەبەر ئەوە ئیسلام ماوەی ئەوەی نەداوە کە خاوەن سامان خۆی پاشە ڕۆژی سامانەکەی دیاری بکات ، بە ئارەزووی خۆی بە هەر کەسێك ، وە یان بە هەر شێوەیەك بیەوێت ، بیبەخشێت و لە ناوی بەرێت ، وەکو ڕژێمی سەرمایەداری ، کە دەسەڵاتی بێسنووری داوە بە خاوەن سامان بۆ دەستکاری سامانەکەی لە پاش مردنی بە ئارەزووی خۆی •

وە یان وەکو هەندێ وڵاتیان میراتی بۆ کوڕی گەورە بەجێ ئەمێنێ، بۆ ئەوەی سەرمایەکە بڵاو نەکات• بەڵام ئیسلام یاسای تایبەتی داناوە بۆ میراتی و دابەش کردنی بەسەر کەس و کاردا ، کە لایەنێکی گرنگە لە دابەش کردنی ساماندا،وە هۆیەکە بۆ دووبارە دابەش کردنەوەی بەسەر زۆرترین ژمارە لە خەڵکیدا ، بە دابەش کردنی سامانی بەجێماو بە سەر کەس و کاری خاوەنەکەیدا •

وە تەنها دەسەڵاتێك ئیسلام داویەتی بە خاوەن سامان ، لەو سامانەی لە دوای بەجێ ئەمێنێ ، سێیەکی ئەو سامانەیە کە خوای گەورە پێی ئەبەخشێت ، ئەویش لە پێناوی هێنانەدی دوو ئەنجامی گرنگدا ، ئەوانیش :

١ ــ بێگومان مرۆڤ لەکاتێکا دێتە سەر کاتی نزیك بوونەوە لە مردن ، ئیتر هیچ هیوایەکی بەم جیهانە نامێنێ ، وە هیچ ئارەزوو و ئاواتێکی دینایی نامێنێ ، چونکە چاوەڕێی جیهانێکی ترە ، کە جیهانی هەمیشەیی یە،لەبەر ئەوە ئەو بەشەی پێی بەخشراوە لە سامانەکەی باشتر وایە بەکاری بهێنێ لە ڕێگای چاکەدا ، لە گەڵ دەست کورت و هەژاراندا، وە لە ڕێگای بەرژەوەندی کۆمەڵدا • واتە ئەم بەخشینە کارێکی

گرنگی هەیە نە بەدی هێنانی دادگەری کۆمەڵایەتیدا ، کە لایەنی هەرە گرنگە لە ڕژێمی ئابووری ئیسلامدا ٠

٢ ـ خاوەن سامان بەو بەشەی پێی بەخشراوە ئەتوانێ دوا ڕۆژێکی باشتر ، یان ژیانێکی باشتر لە جیهانی نوێدا ـ کە بۆی ئەچێت ـ بە دەست بهێنێ ، بە بەکارهێنانی ئەو سامانەی لە ڕێگای چاکەو دەست گرۆیی هەژاراندا ٠ وە یان لە بەرژەوەندیە گشتیەکاندا ٠ چونکە خوای گەورە پاداشتی ئەو چاکەیەی ئەداتەوە لە جیهانی هەمیشەییدا ٠

کەوابوو دیاری کردنی ماوەی خاوەندارێتی تایبەتی ، دوو ئەنجامی گرنگی هەیە :

یەکەم : دابەش کردنی سامان بەسەر ژمارەیەکی زۆر لە کەس‌و کاری خاوەن ساماندا ٠ وە دووهەمیان : بەخشینی ئەو بەشەی بە خاوەن سامان بەخشراوە ، لە ڕێگای چاکەو دەست گرۆیی هەژاران‌و ، بەرژەوەندیە گشتیەکاندا ٠ وە هۆیەکی گرنگە بۆ دووبارە دابەش کردنەوەی داهات ٠ وە ئەبێتە هۆی بڵاو بوونەوەی سامان بەناو زۆربەی کۆمەڵدا ، وە کەم کردنەوەی جیاوازی نێوان هەژارو دەوڵەمەند ٠

بەڵام ئەگەر یەکێك مرد ، وە کەس لە دوای بەجێ نەما ، ئەو سامانەی لە دوای بەجێ ئەمێنێ دەوڵەت دەست ئەگرێت بەسەریاو ئەخرێتە گەنجینەی گشتی وڵاتەوە و بەکار ئەهێنرێ بۆ سوودی گشتی کۆمەڵ ٠

# ڕێگاکانی بە دەست هێنانی خاوەندارێتی

**یەکەم : کارکردن (العمل) :**

ڕێبازی ئابووری ئیسلام کارکردنی بە هەموو جۆرە ڕەواکانیەوە ، بە تاکە ڕێگای بە دەست هێنانی خاوەندارێتی داناوە ، وە ماوە نادات هیچ کەس بە خۆڕایی ببێتە خاوەن سامان‌و دارایی لە سەر مافی یەکێکی‌تر **(للرجال نصیب مما اکتسبوا وللنساء نصیب مما اکتسبن) النساء/٣٢** •

واتە : پیاوان بەشیان هەیە لەوەی پەیدای ئەکەن، وە ئافرەتانیش بەشیان هەیە لەوەی پەیدای ئەکەن • لەبەر ئەوە گرنگیەکی زۆری داوە بە ئیشوکار کردن بە ڕادەیەك ، ئەو گرنگی‌و ڕێز لێنانەی ئیسلام داویەتی بە کارکردن هیچ ڕژێمێك لەم سەر دەمەدا نەیداوەتێ • پێغەمبەر (د•خ) فەرمویەتی : (ئەگەر یەکێك کۆتایی ژیانی هات‌و نەمامێکی پێبوو با بینێژێ) •

هەر چەندە ڕژێمەکانی‌تر لە ژێر پاڵەپەستۆی شۆڕشی کرێکاران دژی خاوەن کارەکان ، بۆ لابردنی زۆرداری‌و چەوساندنەوە لە سەریان، لایان کردۆتەوە بەلای کرێکارانەوە بە نیازی خۆیان •

بەڵام ئیسلام لە سەرەتای سەر هەڵدانیەوە ، هەمان گرنگی داوە بە کرێکارو کارکردن ، وە هانی خەڵکی داوە بۆ کارکردن • وە ماوەی ئەوەی نەداوە کەسێك هەبێ بتوانێت‌و کار نەکات • وە ببێ بە بار بە سەر یەکێکی ترەوە •

لە قورئانی پیرۆزدا لە ٣٦٠ ئایەتا ناوی کارکردن هاتووە ، وە لە ١٠٩ ئایەتا ناوی کردار هاتووە • ئەمەش ئەوە دەرئەخات ، کە تا چ

ڕادەیەك گرنگی دراوە بە کارکردن لـە ئیسلامدا . وە لـەو گرنگیو بایەخەی دراوە بە کارکردن ئەمانەی خوارەوەن :

١ ـ کارکردن ئابڕووی مرۆڤە : پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی : (بە ئابڕووترین دەستکەوت ئەوەیە ، مرۆڤ بەدەستی خۆی بـە دەستی بهێنێ) چونکە کارکردن لە پێناوی پاراستنی کەرامەتو ڕزگار بوون لە پێویستیو نەبوونی‌یە . هـەروەها فەرموویەتی : (هـەرگیز کـەستان خواردنێکی نەخواردووە ، کە باشتر بێت لەوەی بـە کاکردن پـەیدای ئەکات . داودی پێغەمبەری خوا سەلامی خوای لە سەر بێت بە کارکردن ژیاوە) . هەروەها فەرموویەتی : (خوا بەندەی خاوەن باوەڕو خـاوەن پیشەی خۆش ئەوێت) ، عائشەی خێزانی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: (تەشی بە دەستی ئافرەتەوە باشترە لە ڕم بە دەستی جەنگاوەرێکەوە لە پێناوی خوادا) .

٢ ـ کارکردن خوا پەرستی‌یە : لە لایەکی تریشەوە خوای گەورە کارکردنی ، ئەوەندە ڕێز لێ ناوەو نرخی داوەتێ ، تا گەیاندویەتە پلەی خوا پەرستی ، کە بناغەی هـەموو ڕژێمەکانـی ئیسلامەو پیرۆز ترین لایەنیەتی . هەروەها داینـاوە بە پاڕانەوەو داوای لێبووردن لە خوا ، وە سوپاس کردنی خوا ، لەو ڕووەوە. پێغەمبەر فەرموویەتی: (کارکردن خواپەرستی‌یە) هەروەها (د.خ) فەرموویەتی : (هەندێك گوناه هەن ، نە نوێژو ، نە حەجو نە عەمرەش پاکیان ناکەنەوە ، بەڵام پەژارەی بـە دەست هێنانی بژێوی پاکیان ئەکاتەوە) . وا بزانم ئەم فەرموودەیە بەسە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە ، کە ڕژێمی ئیسلام . ڕژێمێکی (واقعی) یـەو هەموو پایەو بناغەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ..هتد. تێدایە. مسلمی کوری یەسار ئەگێڕێتەوە:جارێکیان چەند کەسێك لە ئەشعەریەکان

له کاروانێکدا هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر(د٠خ) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا : کەس لە دوای پێغەمبەر (د٠خ) باشتر نییە لە فلانە کەس ـ کە لە گەڵ ئێمەدایە ـ ، بە ڕۆژ بەڕۆژووە ، کە لە جێگایەك پشوو ئەدەین ٠ ئەو نوێژ ئەکات تا ئەکەوینە ڕێ ٠ پێغەمبەر (د٠خ) فەرمووی : ئەی کێ پێویستی بۆ ئامادە ئەکات و بەخێوی ئەکات ؟ وتیان : ئێمە ، فەرمووی: دە ئێوە هەمووتان لەو باشترن !) هەروەها (د٠خ) فەرموویەتی : (خوای گەورە ڕقی لە بەندەی بێ ئیشە) ٠

٣ ـ کارکردن ئەرکی سەرشانە (فەرزە) : ـ ڕێبازی ئیسلام بەوەوە نەوەستاوە کە هانی مرۆڤ بدات ، وە ئاراستەی بکات بۆ کارکردن ، بەوەی کە کاری داناوە بە ئابڕووی مرۆڤ لە لایەك ، وە دایناوە بە خوا پەرستی لە لایەکی ترەوە ، بەڵکو کارکردنی فەرز کردووە لە سەر هەموو مرۆڤێکی خاوەن توانا **(هو الذی جعل لکم الارض ذلولاً فامشوا في مناکبها وکلوا من رزقه) الملك/١٥** واتە: خوا زەوی مل کەچ کردووە بۆتان ، وە بە هەموو قوژبنەکانیا بگەڕێن ، وە لە بەرهەمی بخۆن ٠ لێرەدا خوای گەورە فەرمانی داوە کە ئەبێ هەموو کەسێك بەپێی توانای خۆی ، لە سەر ڕووی ئەم زەویە ، لە پێناوی ژیاندا بگەڕێت و تێبکۆشێت ٠ ئیسلام بە یاسای تایبەتی ، کارکردنی فەرز کردووە لە سەر شانی مرۆڤ ، وە هیچ کەسێکی خاوەن توانا لە کۆمەڵی ئیسلامدا، نابێ بێکار بمێنێتەوە ٠ پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی : (گەڕان بە دوای ڕۆزی حەڵاڵدا، فەرزێکە لە سەروو فەرزەکانەوە)٠ هەروەها فەرموویەتی: (خوای گەورە ئەفەرموێ : ئەی بەندەی من دەست بجوڵێنە ڕۆزیت ئەدەم) ٠ کەوابوو خوا بۆ هیچ کەس نایبارێنێ لە ئاسمانەوە ، بەڵکو ئەبێ هۆیەك هەبێ بۆ وەرگرتنی ئەو ڕۆزیە لێی ، ئەو هۆیەش تەنها کارکردنە ٠

لێرەدا دەوڵەتی ئیسلام لێپرساوە لە کارپێدانی هەموو کەسێك کە بتوانێت کار بکات ، بۆ ئەوەی ژیانی خۆیی‌و خێزانی دابین بکات ، وە دەوری خۆیشی ببینێ لە بەرهەمی نەتەوەدا • وە هاوبەشی بکات لە پێشخستنی وڵات‌و بەرز کردنەوەی ئاشی ژیانی هاووڵاتیان • ئەنەسی کوری مالك ئەگێڕێتەوە : (جارێکیان پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (د•خ) داوای یارمەتی لێ کرد • پێغەمبەر (د•خ) فەرمووی : لە ماڵەوە هیچت نییە ؟ پیاوەکە وتی : هەندێ کەل‌و پەل‌و پێخەفە شرەو جامێکی ئاو خواردنم هەیە • پێغەمبەر فەرمووی : برۆ بیانهێنە بۆم • پیاوەکە ڕۆیشت‌و هێنانی • پێغەمبەر لێی وەرگرت‌و هەستا لە ناو خەڵکەکەدا وتی: کێ ئەمانەم لێ ئەکرێ ؟ زەلامێك وتی : من ئەیانکرم بە درهەمێك• پێغەمبەر فەرمووی : کێ زیاتر ئەدات ؟ زەلامێکی‌تر وتی : من ئەمەوێ بە دوو درهەم • پێغەمبەر شتەکانی دایەو ، دوو درهەمەکەی لێ وەرگرت ، دای بە پیاوەکەو، فەرمووی : برو بە درهەمێکیان خواردەمەنی بکرە بۆ منداڵەکانت ، وە بە درهەمەکەی‌تر تەورێك بکرەو بۆم بهێنە ، پیاوەکە ڕۆیشت تەورەکەی کری‌و هێنای • پێغەمبەر (د•خ) لێی وەرگرت‌و بە دەستی خۆی کلکی خستە تەورەکە و دای بە دەست پیاوەکەو‌و فەرمووی : برۆ دار ببرە لەو کێوەو بیهێنە بازاڕ بیفرۆشە، وە دوای پانزە ڕۆژ سەرم لێ بدەرەوە •

پیاوەکە پاش ماوەی دیاری کراو هاتەوە خزمەت پێغەمبەرو (د•خ) وتی : لەم ماوەیەدا دە درهەمم پەیدا کردووە ، بە چەند درهەمێکی جل‌و بەرگ‌و پێخەفم کڕیوە ، بەوی تریشی خواردەمەنی • پێغەمبەر (د•خ) فەرمووی : ئەمەت باشترە لەوەی کە لە ڕۆژی قیامەتا داوای یارمەتی لە خەڵك کردن واتە سواڵ کردن ـ لەکە بێت بە ناو چاوتەوە•

ئەمە نمونەیە بۆ ئەوەی کە دەوڵەتی ئیسلام لێپرسراوە لە دابین کردنی ئیشوکار بۆ هەموو کەسێك ، وە نە تەنها ئامادەکردنی کار بۆی، بەڵکو لێپرسینەوەش لە ئەنجامی کارەکەی .

٤ ـ کارکردن خەباتە (جهاد) لە رێی خوادا : هەروەها ئیسلام کارکردنی داناوە بە خەبات لە رێگای خوای گـــەورەدا ، لەو بارەیـەوە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی : (گەڕان بە دوای رۆزی حەڵاڵدا خەباتـــە لە رێگای خوادا) .

ئەگێڕنەوە جارێکیان لاوێکی پێکەوتوو زۆر بـە چالاکـــی بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕی ، کـە لە خزمەت پێغەمبەرا (د.خ) دانیشتبوون . وتیان ، سەیرکەن ئەو لاوە ، خۆزگە ئەو چوستو چالاکیەی لە پێناوی خوای گەورەدا بوایا . پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی : وا مەڵێن ، چونکە ئەگەر ئەو چالاکیەی لە پێناوی خۆیدا بێت ، کە بژیو پێویستی بە کەس نەبێت ئەوە لە پێناوی خوای گەورەدایە . وە ئەگەر لـە پێناوی دایكو باوکێکی پیردا بێت یان بۆ ژیاندنی ماڵو منداڵەکەی بێت ، ئەوە هـەر لە پێناوی خوای گەورەدایە(٣١) .

## دووهەم : پێویستی :

لە خاڵی یەکەمدا ـ کارکردن ـ وتمان تەنها رێگا یەك کە ئیسلام بڕیاری لەسەر داوە بۆ خاوەندارێتی تایبەتی ، کارکردنە . بەڵام ئێمە

(٣١) لەقراآت في الاقتصاد الاسلامي/دکتور فاضل الحسبوە .

له باسی گیروگرفتی ئابووری‌دا ئه‌وممان ڕوون کـــرده‌وه ، له کۆمه‌ڵدا به‌شێك هه‌ن به هۆی که‌م و کوڕی ژیری ، یا له‌شی‌یه‌وه ، ناتوانن هیچ داهاتێك به ده‌ست بهێنن ، وه ده‌زگای دابه‌ش کردنی ئیسلام پێویستی ئه‌وانی به هۆیه‌کی گرنگ داناوه ، بۆ به‌شدار بونیان لـــه داهاتـــی نه‌ته‌وه‌و به‌ڕێوه بردنی ژیانیان به شێوه‌یه‌ك که مل که‌چ و ناچاری هیچ که‌سێك ،وه یان هیچ کارێکی ناڕه‌وا نه‌بن له پێناوی ژیاندا ٠

لێره‌دا له ڕێگاکانی به ده‌ست هێنانی خاوه‌نداریتی‌دا ، ئیسلام هه‌مان باری ڕه‌چاو کردووه‌و پێویستی ئه‌وانی داناوه به هۆی به هێنانی خاوه‌نداریتی بۆیان ، که مافێکی ڕه‌وای خۆیانه‌و هیچ منه‌تێکـی نییه ، چونکه هه‌روه‌کو ئه‌زانین هه‌موو سامانێك له‌م جیهانه‌دا هـی خـــوای گه‌وره‌یه ، خاوه‌نه‌که‌ی ته‌نها فه‌رمانبه‌رێکه له‌و سامانه‌دا ٠ وه‌رگرتنـــی ئه‌و ڕێژه‌یه‌ش ئه‌رکی سه‌ر شانی ده‌وڵه‌ته ٠

هیچ که‌س بۆی نییه شانازیان به سه‌ردا بکات ، وه یان شانازی به خۆیه‌وه بکات ، که به‌شداری کردووه له کۆمه‌کی هه‌ژاراندا ، چونکه ئه‌و که‌سه ته‌نها فه‌رمانبه‌رێتی خۆی لـــه‌و سامانه‌دا به‌ڕێوه بردووه ، وه به ته‌واوی ئه‌و سامانه هی خۆی نییه ، تا شانازی پێوه بکات ، به‌ڵکـــو خوای گه‌وره به‌شێکی ئه‌و سامانه‌ی ئه‌وانی دیاری کردووه بۆ هه‌ژاران٠
**(والذين في اموالهم حق معلوم للسائل والمحروم/المعارج) ٢٤ـ٢٥**
واته : ئه‌وانه‌ی له سامانه‌کانیاندا مافی دیاری کراو هه‌یه بۆ سواڵکه‌رو نه‌داران٠که‌وابوو مافی ڕه‌وای خۆیانه٠هه‌روه‌ها په‌روه‌ردگار فه‌رموویه‌تی
**(انما الصدقات للفقراء والمساكين والعاملين عليها والمؤلفة قلوبهم وفـي الرقاب والغارمين وفي سبيل الله وابن السبيل فريضة من الله التوبة/٦٠**
**سێهه‌م :**

بێجگە لە کارکردنو پێویستی ، کە باسمان کـردن ، چـەند ڕێگایەکی‌تر هەن بۆ خاوەندارێتی تایبـەتی ، ئـەوەی شـایانی باسـە ئەمانیش هەموویان ئەنجامی کارێکی لەوە پێش ئەنجام دراون وەکو :

١ ـ میراتی:میراتی ڕێگایەکە بۆ بە دەست هێنانی خاوەندارێتی لە ئیسلامدا ، ئەویش مرۆڤ پاش مردنی . ئەو سامانەی لە دوای بەجێ ئەمێنێ ، دابەش ئەکرێت بە سەر ئەو کەسانەی لە دوای بەجێ ماون ، بە ڕێژەیەکی دیاری کراو لە یاساکانی ئیسلامدا .

هەروەها وتمان میراتیش ئەنجامی کارێکە کە لەوە پێش ئەنجـام دراوە .. میراتی کارێکی گرنگی هەیـە لـە کاروباری ئابووریدا ، وە هاندەرێکی گەورەیە بۆ هەولدانو زیاتر کارکردنی مرۆڤ ؛ چونکە لـە لایەك دووبارە دابەش کردنەوەی داهاتە لە کۆمەڵدا ، وە بلاو بوونەوەی بەسەر ژمارەیەکی زۆردا لە بریتی یەك کەس . وە لە لایەکی تریشەوە مرۆڤ کە لێی ڕوون بوو پاش خۆی منداڵەکانی یان کەسو کاری سوود لەو سامانو داهاتەی وەرئەگـرن ، زۆر بە شادمانی‌یەوەو بەو پـەڕی دڵسۆزی‌یەوە هـەوڵ ئـەدات وە تێ ئەکۆشێت بۆ بـە دەست هێنـانی داهاتێکی بەرز . بۆ ئەوەی ژیانی ئەوانی باشتر پێ دابین بکات کە لە دوای بەجێ ئەمێنن .

٢ ـ دەستکەوتی جەنگ : مەبەست لە دەستکەوتی جەنگ ئەو سامانو شتومەكو کەلو پەلانەیە لە ئەنجامی جەنگدا لە گەڵ دوژمنانی ئیسلامدا دەست ئەکەوون . ئـەم دەست کەوتە پێنج یـەکی دابـەش ئەکرێت بە سەر ئەوانەی لەم ئایەتەی خوارەوەدا دیاری کراوون **(واعلموا انما غنمتم من شیء فان لله خمسه وللرسول ولذی القـربی والیتامـی والمساکین وابن السبیل) الانفال/٤١** واتە : بزانن ئەو دەستکەوتـەی لە جەنگدا دەستتان ئەکەوێت پێج یەکی بۆ خـواو پێغەمبەری خـواو خزمانی‌و هەتیوانو بێچارانو ڕێبوارانە .

بەلام لــــە سەردەمی عومەری کوڕی خــەتابا (خ) دوو بەشـــی پێغەمبەرو (د٠خ) خزمانی خوایە سەر بەشی یەکەم کە ئەویش بەکـــار ئەهێنرێت بۆ بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکان ، وەکو چاك کردنی ڕێگاو بان، دروست کردنی مزگەوتو خەستەخانە و قوتابخانەو ٠٠ هتد(٣٢) ٠

## پەرەپێدانی خــاوەنداریتی

لە کاتێکا کە خاوەنداریتی تایبەتی سروشتێکی تایبەتی هەیە لە ڕژێمی ئیسلامدا ، وە ڕێگای دیاری کراویش هەیە بۆ بە دەست هێنانی،هەروەها پەرەپێدانیشی سەربەست نەکراوە ، کە هەر کەسە بە ئارەزووی خــۆی پەرەی پێ‌بدات ، وەکو ڕژێمی سەرمایەداری ، بەلکو مرۆڤ لە ئیســلامدا ئەوەندە سەربەستی پەرەپێدانی خاوەنداریتی تایبەتی هەیە کە لە سنووری پەرەپێدانێکی ڕەوادا بێت ، وە بگونجێت لە گەل ڕێبازو مەبەستەکانــی ئیسلام ٠ لەبەر ئەوە ئیسلام دەست ئەخاتە پەرەپێدانی سامانو دارایی‌و ئاراستەی ئەکات ، وەکو لەم خالانەی خوارەوەدا ڕوون ئەبێتەوە :

١ ــ پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی : (هەر کەسێ گزیمان لێ بکات ــ بمان خەلەتێنێ ــ لە ئێمە نییە ــ واتە موسلمان نییە) لە هەموو کارو باری ژیاندا ، بە تایبەتی لە کــاروباری کڕین‌و فرۆشتن‌و ئالو گۆڕدا : پێویستە موسلمان بە هیچ شێوەیەك گزی نەکاو ، درۆ نەکــاو ، کــەم‌و کوڕی شمەکی نەشارێتەوە ، وە دەستی خەلکی نەبڕێت ، بەلکـــو ئەبێ هەموو شتێ لە جێی خۆیداو بە نرخی ڕاستە قینەی خــۆی بفرۆشێت ٠ پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی : کڕیارو فرۆشیار بۆیان هــەیە پەشیمــان ببنەوە لە یەکتر ، خۆ ئەگەر لە ئالو گۆڕەکەیاندا ڕاستیان کرد لــە گەل

---

(٣٢) النظام المالی الاسلامی المقارن/الدکتور بدوی عبداللطیف ٠ لاپەرە/١٢١ ٠

یەکتری ، کەمو کورِی شمەکیان دەرخست ئەوا خوایش فەڕبەرەکەتی ئەخاتە کارەکەیانەوە ، بەلاّم ئەگەر کەمو کورِی شمەکەکانیان شاردەوە ، درۆیان تێدا کرد خوایش فەرِی کارەکەیان هەلّئەگرێ) • چونکە گزیو دەست برِین لە ئیشو کاردا زیان بە کۆمەلّ ئەگەیەنێ • لە ئیسلامدا نابێ هیچ کەس زیانی کەسێکی تری پێ خۆش بێت • وەکو پێغەمبەر (د•خ) فەرموویەتی : (کەستان باوەرِی نابێ تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت) هەروەها لەم بارەیەوە خوای گەورە فەرموویەتی : **(اوفوا الكيل ولا تكونوا من المخسرين ، وزنوا بالقسطاس المستقيم ولا تبخسوا الناس اشياءهم ولا تعثوا في الارض مفسدين) الشعراء/١٨١ـ١٨٣** واتە گزی مەکەن لە تەرازوو و کێشانەدا وە زیانبەخش مەبن بە تەرازوی هاوسەنگ شت بکێشن دزی لە شمەکی خەلّکی مەکەنو خراپەو بەدرِەفتاری لە زەویدا بلاّو مەکەنەوە •

**٢ ـ دابرِکردن (الاحتکار) :ـ هەروەها دابرِکردن لە ئیسلامدا کارێکی نارِەوایە ، زیانێکی گەورە ئەگەیەنێ بە کۆمەلّو ئابووری ولاّت •** لە پێناوی قازانجی چەند کەسێکا یان چەند کۆمپانیایەکدا ، کە دەست ئەگرن بە سەر بازارِدا • لەبەر ئەوە پێغەمبەر (د•خ) فەرموویەتی:(هەر **کەسێ چل رِۆژ خواردەمەنیەك دابرِ بکات لە خەلّکی ، لە خوا دوور ئەکەوێتەوەو ، خوایش لەو دوورە) • چونکە ئەو کەسە دەست ئەگرێت** بە سەر بازارِداو بە ئارەزوی خۆی ، وە بە پێی بەرژەوەندی تایبەتی بەرهەمەکانی بە نرخی گران ئەفرۆشێت ، چونکە لە لایەکی تری بازارِ **لەو بەرهەمەی ئەوان دەست ناکەوێت • لەبەر ئەوە خەلّکی ناچار ئەبێت چەند گرانیش بێت بیکرِێ ، بە تایبەتی پێویستییەکانی ژیان • بێگومان ئەمەش زیانێکی گەورەیە بۆ کۆمەلّ ، وە یاری کردنە بە رِۆزی کۆمەلّو ئابووری ولاّت بە گشتی •**

**لەبەر ئەوە ئیسلام زۆر بە توندی چــووە بە گژیاو بەرگــری لێ کردووە ، چونکە وەکو لە فەرموودەکەی پێشوودا ڕوون کرایەوە دابڕکەر** دووره لە خوا ، وە ئەگەر پاش ماوەیەك پەشیمان بێتەوەو بیکـات بــە حێریش ، هەر خوا لێی وەرناگرێت ٠

**دابڕکردن هۆیەکی گرنگە بۆ بڵاو بوونەوەی بەدڕەفتاری ، چونکــە** ئەوانەی کە هەژارن ناتوانن پێویستی یەکانیان بە گران بگرن٠ لەبەر ئەوە ناچار ئەبن لەپێناوی ژیاندا پەنا ببەنە بەر هەموو ڕێگایەك چ ناڕەوا، چ ڕەوا٠ هەر ئەو هۆیەش بوو وای لە عومەری کوڕی خەتاب(خ)کرد فەرمانبەرەکانی **سەردەمی خۆی وریا بکاتەوە پێیان ڕابگەیەنی کە : (هاوولاتیان برسی مەکەن با کافر نەبن ) چونکە برسێتی دەردێکی ئەوەندە گرانـــە مرۆڤ ناچار بە کافر بونیش ئەکات ٠**

**٣ ــ سوو ! سوو کە بەردی بناغەی سەرمایەداری یە لە ڕژێمـــی** ئیسلامدا کارێکی زۆر ناڕەوایە ٠ بە پێی دەستوورەکانی ئیسلام ، نابێ **موسڵمانان بە هیچ شێوەیەك پەرە بە دارایی و سامانی خۆیان بدەن لــە** ڕێگای خواردنی سووەوە٠خوای گەورە فەرموویەتی : **(وأحلّ الله البيع وحــرم الربا) البقرة/٢٧٥** واتە:خوا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە ، **وە سووی حەرام کردووە ٠**

**(ياايها الذين آمنوا لا تاكلوا الربا اضعافاً مضاعفــة واتقـــوا الله لعلكم تفلحون) الـعمران/ ١٣٠** واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێنـــاوە **سووی دووبارە لە سەر زیاد کراو مەخۆن ، پشت بە خـــوا ببەستن بۆ ئەوەی سەربکەون ٠**

هەروەها لەم بارەیەوە پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی: **(لعن الله آكل الربا وموكله وكاتبه وشاهديه وقال هم سواء)** واتـــە خوا نەفرینـــی

کردووه له سوو خۆر ، وه لەوەی سوو ئەدات ، له نوسەرەکەی ، لـه ئاگادارەکانی ، وه ئەفەرمووێ : هەموویان چوون یەکن .

له ڕژێمی ئیسلامدا پاره ، پاره به دەست ناهێنێ ، بەڵکو کارکردن پاره به دەست ئەهێنێ . سوو هۆیەکه بۆ زۆر کردنی سەرمایەیەك نـه بەرهەمی تێکۆشانو نه بەرهەمی کارکردنه . چونکه پەره پێدانی سامانو دارایی له ڕێگای سووەوه ئەبێته هۆی هاتنه دەرەوەی سەرمایەیەکی زۆر له مەیدانی بەرهەم هێنانو ئاڵوگۆڕدا ، ئەویش ئەبێـه هۆی پەیدا بوونی بێکاریو بڵاوبوونەوەی نەبوونی له ناو دانیشتواندا ، سوو خۆرەکانیش به ئارەزوی خۆیان به سەرییەوه ڕائەبوێرن .

چونکه ئەو سامانەیان به ڕەنجی شان به دەست نەهێناوەو هیـــچ پشتیان پێوەی نەیەشاوه ، ئا لێرەدا جیاوازی چینایەتـــی پەیدا ئـەبێ وەکو وڵاته سەرمایەدارەکان) .

دکتور شاخت بەڕێوەبەری پێشووی بانقی ڕایخ له ئەڵمانیا ، لـه ساڵی ١٩٥٣ی زایینیدا له دمشق له وتارێکدا وتـــی : به عەمەلیەیەکـی ماتماتیکی بێ کۆتایی دەرئەکەوێت،که هەرچی دارایی هەیه لەسەر ڕووی ئەم زەوییه بەرەو دەستی کۆمەڵێك له سوو خۆرەکانی جیهان ئەڕوات .

چونکه ئەوان هەمیشه قازانج ئەکەن ، بەڵام قەرزارەکانیان هەندێ جار قازانجو هەندی جاریش زیان ئەکەن ، له بەر ئەوه له کۆتاییدا بـه حسابی ماتماتیکی ئەبێ هەمووی بەرەو ئەوان بڕوات که هەمیشه قازانج ئەکـەن .

٤ ــ قەدەغه کردنی بازرگانی به شتومەکی ناڕەواوه :

وەکو بازرگانی به خواردنەوەی سەر خۆش کەر و بازرگـــانی بـه

ئابڕووی خەڵکیو ، بازرگانی لە گەڵ دوژمندا ۰۰۰ هتد ۰ هەروەها قومار کردن بە هەموو جۆرەکانیەوە ، وە بازرگانی بە هەر شتێکەوە، یان بەرهەم هێنانی هەر شتێ کە زیانی مادیو گیانیو ویژەیی ۰۰هتد۰۰ بگەیەنێ بە کۆمەڵ ، یان زەمینە خۆش بکات بۆ بڵاوبوونەوەی خراپەو بەدڕەفتـــاری لە کۆمەڵدا ۰ وە بازرگانی بە فلیمی (جنسی)و سیخوڕیو ئەو جـــۆرە فلیمانەی هانی خەڵکی ئەدەن بۆ خراپە ، وە مرۆڤ توشی گرێ کوێـرەی دەروونی ئەکەن ۰ هەروەها ئـەو گۆڤارو ڕۆژونامەو پەرتو کانەی کــە مەبەستیان بڵاوکردنەوەی هەستی (جنس)و پیاو کوشتنو هونەرەکانی تاوانکاری ، ئەوانەی کە زایونزمەکان دەستیان گرتووە بە سەریانـدای ئاراستەیان ئەکەن بۆ مەبەستە گڵاوەکانیان ، ئەویش بۆ بڵاوکردنـەوەی بێ ئابڕوویی‌و بەدڕفتاریو یەرەڵاییە لە هەموو جیهاندا ۰

■ ـ کۆکردنەوەی داراییو نەخستنەکاری :

کۆکردنەوەی داراییو نەخستنەکاری کارێکی ناپەسەندە ، چونکە ئەبێتە هۆی کشانەوەی هەندێك سەرمایە لە مەیدانی کــارو بەرهەم هێناندا ۰ لەبەر ئەوە ئیسلام هانی خەڵکــی داوە بۆ ئەوەی دارایــی کۆنەکرێتەوە دوور لە بەرهەمو مەیدانەکانی ، بەڵکو ئەبێ هەمیشە لـــە کۆڕی کارو بەرهەم هێناندا بێت بۆ ئەوەی ئابووری وڵات بــە خێرایی گەشە بکاتو تەنگەو چەڵەمەی ئابووری ڕوونەدات ۰

خوای گەورە هەڕەشەی کــردووە لەوانـــەی بەو شێوەیـــە پارە کۆئەکەنەوە ، وە نایخەنە کارەوە **(ویل لكل همزة لمزة ، الذي جمـع مالاً وعدده ، يحسب ان ماله اخلده ، كلا لينبذن في الحطمة)الهمزة/١ـ٤**

واتە : دۆزەخ بۆ ئاوانەی کە پارە کۆئەکەنەوەو (نایخەنە مەیدانی کارەوە) هەر ئەیژمێرن ، وا ئەزانن پارەکەیان نەمریان ئەکات، وا نییە، ئەوان بەرەو دۆزەخ ئەبات ۰

ئیسلام چارەسەرێکی گرنگـــی بۆ ئەم ڕواڵەتە داناوە ، ئەویشـ زەکاتە ، کە لە سەدا (٥ر٢)ی پارە ئەبات هـەموو ساڵێك ، وە وای لێ دێت ئەو پارەیەی کۆیان کردۆتەوەو نایخەنەکارەوە،بەرەو کەم بوونەوەی ئەبات ٠

هەروەها ماوە نادرێت بە پەرەپێدانی ئابووری لە هیچ ڕێگایەکـی ناڕەواوە ، وەکو زۆرداریو داگیر کـــردنو دزیو جەردەییو فروفێڵو هەر ڕێگایەکیتر لەو بابەتانە **(ولا تأكلوا اموالكـم بينكـم بالباطل)** البقرة/١٨٨ واتە : بە ناڕەواو نا هەق سامانی یەکتری مەخۆن ٠

# ڕێگاکانی خەرج کردن (الانفاق)

وەکو لەمەو پێش ڕوونمان کردەوە ، سامانو دارایی بە گشتی هی خوای گەورەیە ، وە خوای گەورە کۆمەڵی کردووە بە جێگری خۆی لـەو سامانو دارایییەدا بۆ کەڵك لێ وەرگرتنو بەکار هێنانی لــە ژیانـدا **( لله ملك السموات والارض) الشورى/٤٩** واتە : خـوا خـاوەنی زەویو ئاسمانەکانە ٠ مرۆڤیش وەکو ئەندامێکی کۆمەڵ مافی کـەڵك وەرگرتنی دراوەتێ ، کە بەکاری بهێنێ بۆ سوودی خۆی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان لاوەکی (غير مباشر) ٠

وە هەروەکو لە کـــاروباری ڕۆژانەدا جێگـــری کەسێك ئـەبێ فەرمانەکانی ئەو کەسە بەجێ بهێنێ ، هەر بەو شێوەیەش کۆمەڵ لەبەر ئەوەی جێگری خوای گەورەیە ، پێویستە لە فەرمانەکانی دەرنەچێت،وە بەبێ کەم وکوڕی جێبەجێ یان بکات ٠

لێرەدا هەروەکو ڕێگاکـــانی بە دەست هێنـــانی خاوەندارێتیو چۆنیەتی پەرەپێدانی دیاری کراوە،هەر بەو شێوەیەش چۆنیەتی خـەرج کردنی دەست نیشان کــراوە ، وە ئەبێ مرۆڤ گــوێ ڕایەڵی ئـەو

دەستوورانە بێت ٠

خوای گەورە فەرمانی داوە مرۆڤ لەو سامانەی بە دەستی‌یەوەیە خەرج بکات **(وانفقوا مما جعلكم مستخلفين فيه) الحديد/٧**

واتە : خەرج بکەن لەو سامانەی خوای گەورە ئێوەی کردووە بە جێگری خۆی تێیدا ٠

بەڵام ئیسلام هەروەکو لە هەموو بارێکی ژیاندا مام ناوەندی‌یە ، لە خەرج کردنیشدا مام ناوەندی‌یەو ، فەرمانی کردوە ئەبێ نە ئەوەندە دەست تەنگ بین کە هیچمان لێ هەڵنەوەرێ ، وە نە ئەوەندەش دەست بڵاو هیچمان بە دەستەوە نەمێنێ **(ولا تجعل يدك مغلولة الى عنقك ولا تبسطها كل البسط فتقعد ملوماً محسورا) الاسراء/٢٩** هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : **(كلوا واشربوا ولا تسرفوا) الاعراف/٣١**

واتە : بخۆن‌و بخۆنەوە بەڵام زیادە خۆری مەکەن ٠

هەروەها کۆمەڵ بۆی هەیە دەست بخاتە کارو باری خەرج کردنەوە بۆ ئەوەی زیان نەگەیەنێ بە مرۆڤ ، وە یان بە کۆمەڵ ، وە یان بە دەوڵەتی ئیسلام ، خوای گەورە فەرموویەتی : **(ولا تاتوا السفهاء اموالكم) النساء/٥** واتە : سامانەکانتان مەدەن بە گەوجەکان ٠ مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە مرۆڤی گەوج ناتوانێ سامانی خۆی بە شێوەیەك بەکار بهێنێ کە سوودی نە بۆ خۆی و نە بۆ کۆمەڵیش هەبێ ٠

لەبەر ئەوە دەوڵەتی ئیسلام دەسەڵاتی هەیە لە بریتی کۆمەڵ دەست بخاتە سامانی ئەو جۆرە کەسانەوە ٠

## خەرج کردن لە ئیسلامدا دوو جۆرە :

یەکەمیان : خەرج کردنی (فەرز) کە ئەرکی سەرشانی مرۆڤە ،وە ئەبێ ئەنجامی بدات پێی خۆش بێت یان نا ٠

دووهەمیان : خەرج کردن بە ویستی خۆی : واتـــە مرۆڤ بە دڵی خۆی ئەتوانێ ئەنجامی بدات وە یان نا ٠

خەرج کردنی فەرز بریتی‌یە لە خەرج کـردن لە ڕێگـــای خوادا ، ئەمیش چەند بەشێکە (فەرمانڕەواش بۆی هەیە کە بە زۆر ئەم خاڵانەی خوارەوە ئەنجام بدات بە لێ سەندنی سامان لە خاوەنەکەی بۆ ئەنجـام گەیاندنی ئەم خاڵانەی خوارەوە ئەگەر خۆی ئەنجامی نەدات) :

١ ـ خەرج کردن بۆ خۆیی‌و ماڵو منداڵی‌و خزمو کەسووکاری : خوای گەورە فەرموویەتی : **(وبالوالدين احســاناً وبذي القربـــى)** النساء/٣٦ واتە : چاکەو یارمەتی بە دایکو باوکو خزمان بکەن ٠ وە پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی : (کار کردن ئەگەر بۆ خۆ بەخێوکـردن بێت ، بۆ ئەوەی پێویستی بە کەس نەبێت ئەوە لە ڕێگای خوادایە ،وە ئەگەر بۆ دایکو باوکو منداڵ بەخێو کردن بێت ، ئەوە هەر لە ڕێگـای خوادایە ٠

بێگومان لای هەمووان ئاشکرایە کە مرۆڤ لێپرسراوە بەرامبەر بە ژیانی خۆیی‌و ماڵو منداڵی‌و هەروەها لە ئیسلامدا لێپرسراویشە لە خزمو کەس‌و کاری ، وە ئەبێ بە پێی توانای خۆی بەشداری یارمەتـی دانی هەموو خزمو کەس‌و کاری بکات ٠

٢ ـ هەروەها خەرج کردنی فەرز بریتی‌یە لە هەموو خەرجیەك کە بێتە هۆی بەرز کردنەوەی ئاڵای ئیسلامو بڵاو کردنەوەی ، وە جێبەجێ

کردنی دەستوورو فەرمانەکانی ٠ وە لە سەر میری ئیسلام پێویستە لە سامانی خاوەن سامانەکان وەربگرێت بۆ ئەو مەبەستانەی سەرەوە ،وە بۆ بەرز کردنـــەوەی ئاستی زانیـــاریو رۆشنبیریو تەندروستـــی موسڵمانان(٣٢) ٠

ئەمەیە رێگای ئیسلام لە خەرج کردندا ، کەوا بوو هەر کـــەسێ سەرپێچی بکات،وە رێگایەکی تر بگرێتەبەر ، ئەوە دوورە لە ئیسلامەوە، وە ئیسلام لێپرسراو نییە لـــەو **(انمـا المؤمنون الذين آمنوا بالله ورسوله ثم لم يرتابوا وجاهدوا باموالهم وانفســهم في سبيل الله اولئك هم الصادقون) الحجرات/١٥** واتە : ئەو خاوەن باوەڕانەی ، کـــە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەری خوا هێناوە ، وە هیچ گومـــانیان پـــەیدا نەکردووە لێی ، وە تێ کۆشاون بە گیانو سامانیان لە ڕێی خـــوادا ، ئەوانەن ڕاست ئەکەن ٠

٣ ـ هەروەهـــا خـــەرج کـــردن بۆ کۆمەڵو بـــەرژەوەندییە گشتییەکان ، وەکو لە خاڵی دووهەمدا وتمان ئەرکـــی سەرشانەو ئەبێ جێبەجێ بکرێ ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : **(وفي اموالهم حـــق للسائل والمحروم ) الذاريات/١٩**

واتە : لە سامانەکانیاندا مافی نەدارو سوالکەران دیاری کراوە ٠ هیچ منەتێکی نییە ، چونکە مافی ڕەوای خۆیانـــە لـــەو ساماندا ، وە نابێ خاوەن سامان وابزانێ لە مافی خۆی بەشی ئەوانی داوە چونکـــە سامان ـ وەکو لەمەو پێش وتمان ـ هەمووی هی خوایەو خواش بەشی ئەوانی لە سامانی دەوڵەمەندەکانا داناوە ٠

---

(٣٢) المال والحكم في الاسلام/عبدالقادر عوده ٠

یارمەتی دانی هەژارو بەشداری کردن لە بەرژەوەندی یە گشتی یەکاندا ، جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوایە ، وە بچوکترین کەمتەرخەمی ، وە یان سەرپێچی لادانە لەو فەرمانانەو یاخی بوونە لە خوای گەورە . لەبەر ئەوە دەوڵەتی ئیسلام دەسەڵاتی ئەدرێنێ ، بە زۆر لەو دەوڵەمەندانە بسێنێ بۆ سوودی گشتی کۆمەڵ .

ئەم خەرجیانە هیچ پەیوەندی یەکی نییە بە زەکاتەوە ، هەر چەندە هەندێ کەس وا بیر ئەکەنەوە کە مەبەست لەم خەرجیانە تەنهازەکاتە ، بەڵام راستیەکەی وا نییە ، چونکە زەکات باجێکی دیاری کراوە . وە بۆ جیاکردنەوەیان ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی ئاشکرامان ئەداتێ کە فەرموویەتی: **(ليس البرّ ان تولوا وجوهكم قبل المشرق والمغرب ، ولكن البرّ من آمن بالله واليوم الاخر والملائكة والكتاب والنبيين ، وآتى المال على حبه ذوى القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل والسائلين وفي الرقاب واقام الصلاة واتى الزكاة) البقرة/١٧٧ .**

واتە : چاکە ئەوە نییە کە ڕوو بکەنە ڕۆژ هەڵاتو ڕۆژ ئاوا، بەڵکو چاکە (موسڵمانی) ئەوەیە کە باوەڕی هەبێ بە خواو ڕۆژی زیندو بوونەوەو فریشتەکانو کتێبو پێغەمبەران ، وە بە ویستو ئارەزووی خۆی لەو سامانەی هەیەتی یارمەتی خزمەکانیو هەتیوانو بێچارانو ڕێبوارانو سوالکەرانو ، ڕزگارکردنی کویلە بدات ، وە نوێژ بکاتو زەکاتیش بدات .

لێرەدا بە وردی سەرنج بدە بزانە چۆن خوای گەورە ئەو خەرجیانەی خستۆتە ریزی باوەڕ بە خواو ڕۆژی دوایی یەوە ، وە خستوویەتە پێش نوێژو زەکاتەوە .

واتە ئەو خەرجیانەش وەکو نوێژو زەکات ئەرکی شەرشانی هەموو موسڵمانێکە .

لەم بارەیەوە پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی (لە سامانا جگە لـــە زەکات مافی تریش هەیە) ٠

ڕژێمی ئیسلام ماوە نادات بە ڕەزیلیو دەست تەنگیو پیسکەیی، پارە ٠ کۆکردنەوە، بە شێوەیەك کە دوور بکەوێتەوە لە بەرهەم هێنـان، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی : **(والذين يكنزون الذهب والفضـــة ولا ينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب اليم)التوبة/٣٤** واتە: ئەوانەی ئالتونو زیو کۆ ئەکەنەوەو لە ڕێی خوادا خـەرجی ناکـــەن ، مـژدەی سزایەکی سەختیان بدەرێ ٠ هەروەها پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتـی : (باوەڕی نابــی ـ واتـــە موسڵمان نابێ ـ ئـەوەی خـۆی تێربێتو دراوسێ‌کەشی برسی) ٠ دووبارە فەرموویەتی : (لە هەر گەڕەکێکـــدا برسی‌یەك هەبوو ، ئەو گەڕەکە لە خوا دوورنو خواش لەوان دوورە) ٠

ئەوەی شایانی باسە هـــەر کەسێك بەپێی توانای خـۆی ئەرك ئەخرێتە سەر شانی ، وە هیچ کەس لـــە سەرو تواناای خۆیـــەوە لێی ناپرسرێتـــەوە ٠ **(لا يكلف الله نفســاً الا وسعها) البقـــرة ٢٨٦**

واتە : خوا لە سەرو تواناوە ئەرك ناخاتە سەر شانی کەس ٠

**خەرجی ئارەزوو :**

لەم جۆرە خـەرجیەدا مرۆڤ سەربەستە بـــە ویستو ئارەزووی خۆی ئەتوانێ خەرج بکات وە ئەتوانێ خەرج نەکـات ٠ بەلاَم لە گـەڵ ئەوەدا ئیسلام هانی مرۆڤ ئەدات کە بەشداری هەموو خەرجیەك بکات کە سوودی کۆمەڵی تێدابێت : **(مثل الذين ينفقون اموالهـم في سبيل الله كمثل حبة انبتت سبع سنابل في كل سنبلة مائة حبه والله يضاعف لمن يشاء) البقرة/٢٦١** واتە : ئەوانەی کە سامانەکانیان لە ڕێگـای خوادا خەرج ئەکەن ، وەکو دەنکە گەنمێ وایە کـە سەوز بوو حـــەوت

گول ئەگرێت وە هەر گونە سەد دەنکی پێوەیە،وە خواش زیاتری ئەکات بۆ هەرکەسێ بیەوێ.وە هەر لەم بارەیەوە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: (دەستی یارمەتی درێژ بکەن ، با بە لەتە خورمایەکیش بێت ، چونکـــــە بەری دڵی برسیەك ئەگرێت ، وە گوناە لا ئەبات ، وەکو چۆن ئاو ئاگـر ئەکوژێنێتەوە) .

لە کۆتاییدا خاڵێکی گرنگ ماوە باسی بکـــەین ، ئەویش : ئایا ئەوانەی نیانەو هەژارن ، یا پەك کەوتەنو دەرامەتیان نییە چی بکـەن ؟ بەڵێ هەر چەندە ئەو خەرجیانەی کە باسمان کـرد بۆ ئـــەم چینـــانەی کۆمەڵ دانراوە ، کە ڕزگـــار بکرێن لە هەژاریو ئاستی ژیانیان بـەرز بکرێتەوە، بەڵام لە گەڵ ئەوەشا ماوەیان دراوەتێ ئەمانیش چاکەو خێری خۆیان بکەن ، وە خوای گەورەش پاداشتیان بداتەوە،وەکو ئەفەرمووێ: **( ليس على الضعفاء ولا على المرضى ، ولا على الذين لا يجدون ما ينفقــون من حرج اذا نصحوا لله ورسوله ما على المحسنين من سبيل والله غفــور رحيم) التوبة/٩١ .**

واتە : دڵتەنگ نەبن ئەوانەی کە نیانە یان نەخۆشو پەك کەوتەن، کە نیانە چاکەی لەسەر بکەن ، ئەگەر ئامۆژگاری چاکەیان کـــرد لــە پێناوی خواو پێغەمبەری خـــوادا ، چونکــــە ئەمە جێگـــای ئەویان بۆ ئەگرێتەوە .

جارێکیـــــان هەژارێك هاتە خـــزمەت پێغەمبەر (د.خ) وتـــــی : (دەوڵەمەندەکان بە دەوڵەمەندی ئەڕۆن چونکە نوێژ ئەکەن وەکو ئێمە ، ڕۆژو ئەگرن وەکو ئێمە،وە بە زیادەی سامانەکانیان خێرو چاکە ئەکەن. پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی :

ئایا خوا هیچی بۆ ئێوه دانەناوه کە چاکەی پێ بکـــەن ؟ ئێوه بە هەر بیرکردنەوەیەك لە خوا چاکەیەکتان هەیە ، وه بە هەر **(الله اکبر)** وتنێ چاکەیەکتان هەیە ، وه فەرمان بەچاکە کردن چاکەیە بۆتـان ، وه بەرگری لە خراپە کردن چاکەیە بۆتان ۰۰۰هتد(۳۳)۰

## خاوەندارێتی گشتیو خاوەندارێتی دەوڵەت

موسڵمانەکان لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا زەویو زاریان بە پێی بارو دۆخی زەوییەکەو چۆنیەتی دەست بـە سەراگـــرتنی ، کردووه بە سێ بەشەوه :

بەشی یەکەم : ئەو زەویو زارانەی بە هێز واتە بە جەنگ ڕزگار کراون، وەکو زەوی و زاری عێراقو شامو میسر ۰

بەشیو دووهەم : ئەو زەویو زارانەی کە دانیشتوانی خۆیان داوه بـە دەستەوه ، پاش هێرش کـــردنە سەریان لـــە لایەن موسڵمانەکانەوه ، و قایل بوون لـــە ژێر دەسەڵاتـی دەوڵەتـی ئیســـلامدا بژین ۰ بـــەڵام لەسەر ئایینو بیروڕای خۆیان بمێننەوه ۰ ئەم زەوییانە ناو ئەبرێن بە زەویو زاری ڕێکەوتن ۰

بەشی سێهەم : ئەو زەویو زارانـەی بە بێ جـــەنگ دانیشتوانـــی موسڵمان بوونو ، قایل بوون بە دەوڵەتـی ئیســـلام وەکو مەدینەو ئەندەنوسیاو ۰۰۰ هتد ئەمە لە ڕووی دەست بە سەرا گرتنی زەویو زارەکانەوه هەروەهـا لە ڕووی بارو دۆخی سروشتییەوه کـراوه بە چـەند بەشێکەوه :

---

(۳۳) اشتراکیة الاسلام/دکتور مصطفی السباعی ۰ لاپەڕه : ۲۰٤

١ ـ ئەو زەوی‌و زارانەی بە دەست خەڵکەوە بوون‌و کشتوکاڵی تێدا کراوە واتە ئاوەدان بوون ·

٢ ـ ئەو زەوی‌و زارانەی بە شێوەیەکی سروشتی لە بار بوون بۆ کشتوکاڵ یان دارستان بوون ، بەڵام ئاوەدان نەبوون ، واتە خاوەنیان نەبووە ، بە دەست کەسەوە نەبوون ·

٣ ـ ئەو زەوی‌و زارانەی کە نالەبار بوون‌و بە کەڵکی کشتوکاڵ نەهاتوون بە بێ ئەوەی دەستکاری بکرێت ، وە پێویستی‌یان بە کارێکی زۆر هەبووە بۆ چاك کردن‌و زیندو کردنەوەیان ·

ئینجا بۆ ئەوەی بتوانین شێوەو چۆنیەتی خاوەندارێتی گشتی‌و خاوەندارێتی دەوڵەت ڕوون بکەینەوە · پێویستە بگەڕێینەوە بۆ شێوەو چۆنیەتی جێبەجێ کردنی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا وە بە تایبەتی سەردەمی پێغەمبەرو (د·خ) چوار جێگرەکەی ، تا بزانین بە چ جۆرە سامان‌و زەوی‌و زارێکیان کردووە بەو دوو جۆرە خاوەندارێتی‌یە ، بۆ ئەوەی بەڵگەیەکی مێژوویی‌و جێبەجێ کراو بخەینە پێش چاوی خوێنەری خۆشەویست کە لە سەردەمی ئیسلامدا جێبەجێ کراوە ، لە کاتێکا لەو ڕۆژگارەدا ، ئەو جۆرە خاوەنداری‌یانە هەر ناویشیان نەبووە لە جیهاندا · بەڵام ئایینی ئیسلام ،کە ڕژێمێکی پێشکەوتوو و دادگەرە، دژی چەوساندنەوەو هەموو جۆرە بەکار هێنانێکی ناڕەوایە ئەو جۆرە خاوەنداری یانەی داهێناوەو جێبەجێی کردووە ، بۆ ئەوەی ببێتە سەر چاوەیەکی گرنگ بۆ هێنانەدی دادگەری کۆمەڵایەتی‌و نەهێشتنی هەژاری‌و ترس‌و لەرز لە ژیانی کۆمەڵدا ·

بێگومان ئامانجی سەرەکی هەردوو خاوەنداری‌یەکە ،یەك ئامانجە، ئەویش بەکار هێنانیانە بۆ بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵ‌و دەوڵەتی ئیسلام·

تا ئەو ڕادەیەی هەندێ لە ئابووری ناسە موسڵمانەکان هەردوو جۆرەکەیان بە خاوەندارێتی گشتی داناوەو ناوی خاوەندارێتی دەوڵەتیان نەبردووە ٠

بەڵام وەکو لە پێشەوە وتمان هەندێ لە زاناکان جیایان کردۆتەوە٠ چونکە جیاوازی هەیە لە نێوانیاندا وەکو لەمەو دوا بۆت ڕوون ئەبێتەوە ، ئێستاش با بگەڕێینەوە سەر باسی خاوەندارێتی گشتی و دەوڵەت و چۆنیەتیان لە زەوی و زاردا ، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا ، وە بە پێی ئەو بەشانەی جیامان کردنەوە :

یەکەم : لە بەر ئەوەی زەوی زاری بەشی یەکەم هەردوو جۆرە خاوەنداری‌یەکەی تێدا دیاری کراوە، وا لە خوارەوە بە درێژی لە هەردوکیان ئەدوێین :

## خاوەندارێتی گشتی لە زەوی و زاردا

ئەو زەوی و زارانەی بە جەنگ لە لایەن موسڵمانەکانەوە ڕزگار کران ، وەکو زەوی و زاری عێراق و شام و میسر ، کە لە سەردەمی عومەری کوری خەتابا دەستی بە سەرا گیرا ، هەر چەندە زۆر موسڵمانەکان ، داوایان کرد کە دابەش بکرێت بە سەر ئەوانەی بەشداری ئەو جەنگەیان کردووە ، وەکو دەست کەوتەکانی تری جەنگ ، بەڵام عومەری دادگەر وە بە ڕاوێژی چەند کەسێك لە موسڵمانەکان ، بڕیاری دا کە دابەش نەکرێت(٣٤) ٠

بەڵکو کردیە خاوەندارێتی گشتی موسڵمانان ، وە هێشتیەوە بە دەست خاوەنەکانیانەوە ، بەرامبەر بە باجێ (خەراج) کە خرایە سەر ئەو

---

(٣٤) النظام المالي الاسلامي المقارن لاپەرە : ٥٢

زەوی‌یانە ۰ وە ئەو باجە خەرج ئەکرا بۆ سوودی گشتی کۆمەڵ ۰وەکو ئەم نامەیەدا دەرئەکەوێت کە عومەر (خ) ناردی بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس: (نامەکەت گەیشت کە تێیدا ڕوونت کردبووەوە کە موسڵمانەکان ئەیانەوێ ئەو دەستکەوتانەی دەستیان کەوتووە دابەش بکرێت بە سەریاندا ۰

هەرچی کەل‌و پەل‌و دەست کەوتی تر هەیە هەمووی دابەش بکە بە سەریاندا ، بەڵام واز لە زەوی زارو ڕووبارەکان بهێنە ، با بە دەست ئەوانەوە بێت کە بە دەستیانەوەیە بۆ ئەوەی بمێنێتەوە بۆ موسڵمانان، چونکە ئەگەر دابەشی کەین بە سەر ئەوانەی ئێستا ئامادەن ، هیچ نامێنێتەوە بۆ ئەوانەی دوای ئەم بەرەیە (جیل) دێن)(۳۵) ۰

واتە خاوەنی ڕاستەقینەی ئەو زەوی‌یانە موسڵمانەکانن هەموویان، وە ئەوانەی کە ئێستا وا بە دەستیانەوە ، هی خۆیان نییەو بۆیان نییە جگە لە بەرهەم هێنانی‌و کەڵك لێ وەرگرتنی ، هیچ مامەڵەیەکی تری پێوە بکەن ، وەکو فرۆشتنی وەیان بەخشینی ۰۰۰ هتد ۰

بۆ نمونە یەکێ لە موسڵمانەکان بە ناوی عەتەبەی کوڕی فەرقود ، پارچەیە زەوی لە کەناری ڕووباری فورات کڕیبوو لە خاوەنە پێشووەکەی، کاتێ کە عومەر پێی زانی ، بانگی کرد پێی وت : ئەو زەوی‌یەت لە کێ کڕیوە ؟ وتی : لە خاوەنەکەی ۰ عومەر موسڵمانەکانی کۆکردەوەو وتی: ئەمانە خاوەنی ئەو زەوی‌یەن ، ئایا لەمانەت کڕیوە ؟ وتی نەخێر ۰

عومەر وتی : کەوابوو بی‌گێڕەوە بۆ ئەوەی لێت کڕیووەو پارەکەی خۆتی لێ وەربگرەوە(۳۶) ۰

---

(۳۵) الاموال/ابو عبید قاسم بن سلام لاپەڕە/۵۹
(۳٦) الاموال ۰ لاپەڕە/۷٤

هەروەها لە سەردەمی پێغەمبەرا (د٠خ) خۆی خـــەیبەری دا بـــە جولەکەکان کە بەرهەمی بهێنن بەرامبەر بە بەشێکی بەرهەمەکەی ، واتـــە بەشێکی بۆ جولەکەکانو بەشەکەی تری بۆ موسڵمانەکان(٣٧) ٠

لە بارەی ئەو جۆرە زەوییانەوە پێشەوا مالك فەرموویەتی : (ئەو زەوییانە دابەش ناکرێت ، بەڵکو ئەکرێت بـــە (وەقفـــی) موسڵمانانو بەرهەمی باجەکەی (خەراج) خەرج ئەکـــرێت بۆ بەرژەوەندی گشـــتی موسڵمانان وەکو موچەی جەنگاوەران ، دروست کردنی ڕێگـــاو بان ، پرۆژە گشتییەکان ٠٠٠

## دووهەم کانو کانزاکان :

هەموو جۆرە کانزایەك کـــە لە ژێر زەویدایە ، نزیك بێت یان دوور لە سەر ڕووی زەوی ، ئەکرێتە خاوەندارێتی گشتی بۆ هەموو خەڵکی ٠ لێرەدا لەوانەیە هەندێ کەس بڵێن لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا، زۆر کەس کانزایان دەرهێناوە ، هەر کەسە بۆ خۆی ، بـــەڵام ئەمە ئـــەوە ناگەیەنێ کە ئەبێ کانزا بکرێت بە خاوەندارێتی تایبەتی ، نەبەر ئـــەوەی بە هۆی کارەوە مرۆڤ ئەتوانێ کانزا دەربهێنێو ببێتە خاوەنی،چونکـــە لەو سەردەمەدا توانای دەرهێنانی کـــانزا ئەوەندە نـــەبووە ، کـــە کەسێك بتوانێ دەست بگرێت بە سەر کانێکی گـــەورەداو ماوە نەدات کەسی تر سوودی لێ وەربگرێت ، وە ببێتـــە خـــاوەنی سەرمایەیەکـــی گەورە ، بەڵکو هەر کەسە بە پێی پێویستی تایبەتی خۆی دەری هێناوەو کەڵکی لێ وەرگـــرتووە وە نەیتوانیـــوە ئەوەندە دەربهێنێ ، تەنگ بـــە خەڵکی هەڵچنێو زیان بگەیەنێ بە خەڵکی وە یان بە کۆمەڵ بە گشتی ٠

---

(٣٧) ژیانی پێغەمبەر /مامۆستا عبدالعزیز پارەزانی ــ لاپەڕە/٤١٤

بەڵام ئێستا بە هۆی پێشکەوتنی پیشە سازیو زانستی‌یەوە ،وە پەیدا بوونی ئامێرو کەرەسەی پیشە سازی فراوان ، توانای کان دەرهێنان ئەوەندە فراوان بووە ، کەسێك ئەتوانێ ئەگەر ماوەی بدرێت بە تەنها دەست بگرێت بە سەر چەندەها کاندا ، وەکو وڵاتە سەرمایەدارەکانی ئەم سەردەمە ئەمەش ئەبێتە هۆی پەیدا بوونی جیاوازی چینایەتیو دروست بوونی چەوساندنەوەی کرێکاران . لەبەر ئەوە ئیسلام ماوەی ئەوە نادات هەر کەسە هەستێو بە پێی توانای خۆی دەست بکات بە کانزا دەرهێنان ، بەڵکو بریتی‌یە لە خاوەندارێتی گشتی . وە دەوڵەت وەکو نوێنەری کۆمەڵ هەڵئەستێ بە ئەنجام دانیو سەرپەرشتی کردنی بۆ سوودی گشتی کۆمەڵ .

## سێهەم ئاوو سەر چاوەکانی :

هەموو ئاوو سەر چاوەی ئاوە ئاشکراو سروشتی‌یەکان ، وەکو دەریاو ڕووبارو سەرچاوەکان ، خاوەندارێتی گشتین ، وە هەر کەسە بۆی هەیە بە پێی پێویستی خۆی سوودیان لێ وەربگرێت ، چ بۆ خواردنەوەو چ بۆ ئاودێرییو چ بۆ بەکارهێنانی‌تر ، بەڵام بۆی نییە تەنگ بە خەڵکی هەڵچنێو بێ ئاوی‌یان پێ بگەیەنێ .

بەڵام ئەگەر کەسێك خۆی سەر چاوەیەکی بە دەست هێنا ، وەکو هەڵکەندنی بیرێك یان کارێزێك ، ئەوە مافی ئەوەی هەیە کەڵك لەو کارەی وەربگرێت ، وە ئەو ئاوەی پەیدای کردووە بە کاری بهێنێ بۆ سوودی تایبەتی خۆی . وە کەس بۆی نییە بەشداری ئەو مافەی بکات. وە یان لێی بستێنێ ، تا لە خۆی زیاتر نەبێت . بەڵام ئەگەر لە خۆی زیاتر بوو ، ئەوا بۆی نییە لە خەڵکی دابیڕێو نەهێڵێ کەسێکی‌تر کەڵکی لێ وەربگرێت . چونکە ئەو کەسە بەو کارەی ئەنجامی داوە ، تەنها

ئەوەندە ماڵی بەدەست هێناوە کە کاری خۆی پێ ئەنجام بدات ٠ بەڵام لەبەر ئەوەی لە بناغەدا ئاوی ژێر زەوی‌یەکە بە هۆی کـــاری ئـەوەوە دروست نەبووە ، ئەوا بۆی نییە ئەو ئاوەی لە خۆی زیاتر بێت دەســتی بە سەردا بگرێت ، بەڵکو خەڵکی‌تر بۆیان هەیە کـــەڵك لەو زیادەیـــە وەربگرن ٠

## خاوەندارێتی دەوڵەت

ئەم خاوەندارێتی‌یە لـــە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا ئـــەم سامانانەی خوارەوەی گرتۆتەوە :

**یەکەم :** ئەو زەوی‌و زارانەی ئاوەدان نەبوون ، واتە بە دەست کەسەوە نەبوون ، بەم زەوی‌یانەیان وتووە (أنفال) وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: **(یسألونك عن الانفال قل الانفال لله والرسول)الانفال/١**
واتە : لێت ئەپرسن دەربارەی ئەنفال بڵێ ئەنفال هی خواو پێغەمبەری خوایە ٠

هەروەها لە کاتێکا پێغەمبەر (د٠خ) کۆچی کرد بۆ مەدینە،هەرچی زەوی‌و زاری ئاوی نەدەگەیشتێ دایان بە پێغەمبەر (د٠خ) کـــەچی لێ ئەکات لێی بکات(٣٨) ٠

بێ‌گومان ئەمەش جێبەجێ کردنـــی ئەو جـــۆرە خاوەنداری‌یـــە ئەسەلمێنێ لەو سەردەمەدا ٠ ئەم زەوی‌یانە ، هـــەموو ئەو زەوی‌یانـــە ئەگرێتەوە کە دەوڵەتی ئیسلام دەسەڵاتی هەبووە بـــە سەریا ٠ واتـــە زەوی‌و زاری مردووی (پشت گوێ خراو)ی هەر سێ بەشەکەی کـــە

---

(٣٨) الاموال : ٢٨٢

له پێشەوە باسمان کردن (بە هێز ڕزگار کراو ، ڕێکەوتن ، بـــە بێ جەنگ موسڵمان بوون) •

**دووهەم :** هەر زەوی‌یەکی لە بارو ئاوەدانی سروشتی،وە هەموو دارستانێك کە بەبێ جەنگ هاتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامەوە •

**سێ‌هەم :** ئەو زەوی‌یانەی خاوەنەکانیان بەخشیویانن بە دەوڵەتی ئیسلام •

**چوارهەم :** ئەو زەوی‌یانەی خاوەنەکانیان تیاچوونو نەماوون، وەکو زەوی‌یەکانی پاشاکانی فارس لە عێراق، وە هەر زەوی‌یەك خاوەنی نەبووبێ •

**پێنجەم :** هەر زەوی‌یەك تازە دروست ببێ ، وەکو دەرکـــەوتنی دوورگەیەك لە دەریادا • ئەمە لە بارەی زەوی‌و زاری بەشی یەکەمەوە ، کە دابەش کراوە ، بە سەر خاوەندارێتی گشـــتی‌و خـــاوەندارێتـــی دەوڵەتەوە • بەڵام دوو بەشەکەی‌تر بەم شێوەیەی خوارەوە بووە :

**بەشی دووهەم :**

ئەو زەوی‌و زارانەی کە دانیشتوانی خۆیان داوە بە دەستەوە پاش هێرش کردنە سەریان ، لە لایەن موسڵمانەکانـــەوە • وە قایل بوون لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامدا بژین ، بەڵام لە ســـەر ئایینی خۆیان بمێننەوە ، وە ڕێکەوتوون بە پێی ڕێکەوتن نامەیەك کە هەر دوولا مۆریان کردووە ، بە پێی ئەو خاڵانەی لەو ڕێکەوتن نامەیەدا بووە جۆری خاوەندارێتی ئەو زەوی‌و زارانەی کـە بـە دەستیانەوە بووە • وە ئاوەدان بوون بڕیاری لـــە سەر دراوە • وەکو خەڵکی نەجرانو ئیلەو ئەرزەعات و هەجەر •

لە بارەی ئەو زەوی وزارانەوە قازی ئەبو یوسف لە کتێبی **(الخراج)** دا نووسیویەتی : (هەر کۆمەڵێك لە کافرەکان کە پێشەوا ڕێکەوت لە گەڵیان ، بەو مەرجەی واز لە فەرمانڕەوایی بهێنن‌و باجی **(خەراج)** بدەن ئەوە دائەنرێن بە **(اهـــل الذمة)** وە زەوی‌یەکانیـــان زەوی خەراجی ئەبێت،وە تەنها ئەوەیان لێ ئەسەنرێ کە لە سەری ڕێکەوتوون، وە لەوە زیاتریان لێ ناسەنرێ)(٣٩)۰

هەروەها پێغەمبەر (د۰خ) فەرموویەتی : (لەوانەیە ئێوە بجەنگــن لە گەڵ گەلێکدا ، وە ئەوانیش پارێزگاری خۆیان ئەکەن بە سامانیان ، نەك بە خۆیان‌و منداڵیان ، وە لە گەڵتان ڕێك ئەکەون ، وە ئەبێ لەوە زیاتر کە لە سەری ڕێکەوتوون هیچیـــان لێ نەسێنن ، چونکـــە بۆتان ڕەوا نییە)(٤٠) ۰

بەڵام ئەمە تەنها ئەو زەوی‌یانە ئەگرێتەوە کە بە دەستیانەوە بووەو بەرهەمیان هێناوە ، چونکە ئەو زەوی‌یانەی بە دەستیانەوە نـەبووە چ لەبارو باش بووبێ بۆ کشتوکاڵ ، وە چ بە کەڵکی کشتوکاڵ نەهاتبێ ، ئەبێتە خاوەنداریتی دەوڵەت وەکو باسمان کرد ۰

**بەشی سێهەم :**

ئەو زەوی‌و زارانەی بە بێ جەنگ دانیشتوانـــی موسڵمان بوون ، ــ واتە بە گەیشتنی دەنگی ئیسلام پێیان ــ وەکو مەدینەو ئەندەنوسیاو چەند جێگایەکی‌تر لە نیشتمانی ئیسلام ۰

ئەمانە ئەو زەوی‌یانەی بە دەستیانەوە بووە ، دراوە بـــە خۆیان بە شێوەی خاوانداریتی تایبەتی ، وە باجی (دەیەکیان) لێ سەنراوە(٤١)۰

---

(٣٩) الخراج/للقاضی ابو یوسف : ٢٨

(٤٠) الاموال : ١٤٣

(٤١) ملكية الارض في الاسلام أبو الأعلى المودودي : ٢٦ــ٢٧

ئەبو عوبـەید قاسم کـوڕی سەلام لـە کتێبی (الامـوال)دا نوسیویەتی : (هەر زەوی‌یەك خاوەنەکەی موسڵمان بوو لە سەری، ئەوە زەوی خۆیەتی وەکو مەدینەو تائفو یەمەن بەحرەین ، وە هەروەهـا مەکەش هەر چەندە مەکە بە جەنگ ڕزگار کـرا . بەڵام پێغەمبەر (د٠خ) وازی لێهێنان نەدەستی لـە خۆیاندا ، وە نـە دەستی لـە زەوی‌و سامانیاندا ، وە کاتێ زەوی‌و سامانەکانیان درایـە ، ئینجـا موسڵمان بوون ، لە سەر ئەوەی کە بە دەستیانـەوەیە ، لێرەدا زەوی‌یەکـانیان بوو بە زەوی (دەیەك)(٤٢) .

دووبارە هەمان نوسەر نوسیویەتی : (لە جێماوەکانی پێغەمبەرو (د٠خ) جێگرەکانی کە بۆمان ماوەتەوە ، دەرکەوتووە دەربارەی زەوی بە سێ جۆر فەرمان هاتووە : هەر زەوی‌یەك خاوەنەکەی لە سەری موسڵمان بووە ، ئەبێ بە هی خۆی‌و تەنها (دەیەکی) ئەکەوێتە سەر(٤٣) .

لێرەدا ئەو زەوی‌یانەی لەبار بوون بۆ کشتوکاڵ ، وە یان باخ‌و دارستان بوون ، بەڵام بە دەست کەسەوە نەبوون ، وە هەروەها زەوی پشت گوێ خراوو نالەبار بۆ کشتوکاڵ ، وە بە دەست کەسەوە نەبوون، ئەمانە ئەبنە خاوەندارێتی دەوڵەت .

---

(٤٢،٤٣) : الاموال/٢٥

# بـەرەو

# دادگـــەری کۆمەڵایەتی

پێغەمبەر درودو سەلامی خوای لێ بێت فەرموویەتی : (ئەگـــەر کەسێك بـە برسێتی مایەوە سامان هی کەس نییە)٠

# بەرەو دادگەری کۆمەڵایەتی

دادگەری دروشمی سەرەکی ڕژێمی ئیسلامە ، لە هەموو لایەنێکی ژیاندا ، وە هەمیشە ئامانجی دەوڵەتی ئیسلام بووە · مێژووی ئیسلام لە سەردەمی پێغەمبەرو (د·خ) چوار هاوڕێکەیدا(٤٤) · بەڵگەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەو مەبەستە ، کە دەوڵەت هەمیشە لە هەوڵو تێکۆشاندا بووە بۆ پاراستنی ژیانو گیانو ئازادیو کەرامەتی دانیشتووان · وە زۆرداریو چەوساندنەوەو هەژاریو تایەفەگەریو ناکۆکیان لەناو کۆمەڵی ئیسلامدا کردە دەرەوەو لە بریتی هەموویان برایەتیو خۆشەویستیو چاکە کردنو دادگەری جێیان گرتنەوە ·

ڕژێمی ئیسلام موسڵمانان پەروەردە ئەکاتو تۆوی هەست بە لێپرسینەوە بەرامبەر بە خۆیو خێزانەکەیو کۆمەڵو مرۆڤایەتی لە دڵیانا ئەچێنێ · وە ویژدانێکی وا زیندویان تیا دروست ئەکات هەمیشە چاودێرو هاندەرێکی سەرەکییە بۆ شێوەو چۆنیەتی ڕەفتارو کردەوەکانی بە شێوەیەك لە یاساو دەستورەکانی ڕژێمی ئیسلام دەرنەچێت ، وە نمونەی لە خۆ بوردنو قوربانیدان بێت لە پێناوی میللەتو نیشتمانەکەیدا ، چونکە باوەڕ بە خواو ، ئیسلام بون ئەوەیە کە لە کردەوەدا دیاری بدات ، هەر وەکو پێغەمبەر (د·خ) فەرموویەتی :
(باوەڕ ئەوەیە جێگیر ببێ لە دڵداو ، کردەوەش بیسەلمێنێ)

گومانی تێدا نییە مانەوەی زۆر لە موسڵمانان لەم سەردەمەدا ، وە پاش دەیان ساڵ دوور کەوتنەوە لە فەرمانڕەوایی وەکو لەمەو پێش

---

(٤٤) هەروەها لە سەر دەمی عومەری کوڕی عەبدول عەزیزدا · کە زۆر لە مێژوو نوسان بە خەلیفەی پێنجەم ناوی ئەبەن ·

باسمان کرد لە سەر بەجێ هێنانی ئەرکە ئیسلامیەکانی سەر شانیان بە بێ ئەوەی یاساو ڕژێمی ئەم سەردەمە داوایان لێ بکات (بەپێچەوانەوە دەیان کۆڕو کۆمەڵی جیاجیای دژ بە ئیسلام هەمیشە خەریکی هاندانی خەڵکین بۆ دوور کەوتنەوە لە ئیسلام) ئەو هەستەش نیشانەیەکی دیاری یە بۆ ئەو پەروەردە ئیسلامی یە و ، جێگیر بوونی لە دڵو دەرونی موسڵمانانندا ، کە بە خۆشی خۆیان هەڵئەستن بە ئەنجام دانی ئەو ئەرکانە٠ وەکو نوێژوو زەکات دانو یارمەتی دانی یەکتری‌و نەپچڕاندنی خێزانو ڕێزگرتنو بەخێو کردنی دایكو باوك ، هەروەها بەخێو کردنی منداڵان لە لایەن دایكو باوکەوە تا ئەبنە خاوەنی ماڵو خێزانی خۆیان(٤٥) ٠

ئەم پەروەردەیە نمونەیەکی گرنگی ژیانی موسڵمانێتی یە ، کە جگە لە ئیسلام هیچ ڕژێمێك لەم جیهانەدا نەیتوانیووە بەو شێوەیە جێگای خۆی بکاتەوە لە دڵی ڕۆڵەکانیا ٠

ڕژێمی ئیسلام هەمیشە ئاڵای دادگەری کۆمەڵایەتی بەرز کردۆتەوە، وە هەر کاتێ موسڵمانان بیانەوێ بکەن بە دادگەری‌و بەختیاری‌و پێشکەوتن هیچ ڕێگاو چاریکیان نییە جگە لە گەڕانەوە بۆ ڕژێمی ئیسلام ٠ ئیسلام بە دوو شێوە مرۆڤ ئامادە ئەکات بۆ جێبەجێ کردنی یاساو دەستورەکانی :

---

(٤٥) نەك وەکو وڵاتە بەناو پێشکەوتووەکان کاتێ کوڕو کچ ئەگەنە تەمەنی هەرزەکاری ئیتر باوكو دایك لێ‌پرسراونین لە بەخێوکردنو ئاراستەکردنیان ، بەڵکو ئەبێ خۆیان هەستن بە بەخێوکردنی خۆیان ٠ ئەمەش هۆیەکی گەورەیە بۆ بێ‌ئابڕوویی ئافرەت لەوێ، چونکە کەس نییە بەخێوی بکات ، ئەبێ خۆی خۆی بەخێو بکات٠

**یەکەم : پەروەردە کردن :** پەروەردە کردنی مرۆڤ‌و چاندنــــی هەستێکی زیندوو لە دڵیا ، کــە خۆ بەخۆ هەستێ بە جێبەجێ کردنـــی ئەرك‌و یاساکانی ئیسلام ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوە :

١ ـ لە ڕژێمی ئیسلامدا مرۆڤ تەنها بەندەی خوای گەورەیــە ، وە تەنها ئەو ئەپەرستێ ، وە لە هەموو کــاروبارێکـــی ژیاندا داوای یارمەتی تەنها لەو ئەکات **(ایاك نعبد وایاك نستعین)** تۆ ئەپەرستین‌و پشت بە تۆ ئەبەستین · هەروەها مرۆڤ دڵنیایە کە خۆشی‌و ناخۆشی‌و قازانج‌و زیان هەمووی بە دەست خوایە ، وە بە بێ ڕەزامەندی ئەو هیچ شتێ ڕوو نادات **(قــل لــن یصیبنا الا ماکتب الله لنا هـــو مولانا)**

واتە : ئەی محمد بڵێ : هیچ گیروگرفتێ توشی ئێمە نابێت جگە لەوەی کە خوا نوسیوویەتی · وە هەموو هێـــزی سەر زەوی دەسەڵاتـــی بە سەر مێشێکـــدا نییە بە ڕەزامەنـــدی خـــوای گـــەورە نەبێت : **(وان یسلبهم الذباب شیئاً لا یستنقذوه منه ضعف الطالب والمطلـــوب)** الحج ٧٣ · واتە : ئەگەر مێشێك شتێکیـــان لێ بسێنێ ناتوانن لێی بسێننەوە · گومانی تێدا نییە کۆمەڵێك لە ژێر سایەی ڕژێمێکـــی وادا بژی ، دڵنیایە لە گیان‌و ژیانی‌و هیچ غەم‌و پەژارەیەکی نابێ‌و هەمیشە دڵ ئاسوودەیە ، چونکە لێی ڕوونە هەرچی لەم جیهان‌و گەردوونەدایــە لە ژێر دەسەڵاتی خوای گەورەدایە ، کەس ناتوانێ هیچ زیادە ڕۆیی‌یەك بکات بە سەر کەسێکی تردا(٤٦) ·

هەروەها ژیان‌و ڕۆزی‌و گوزەرانیشی هـــەر بە دەست خـــوای گەورەیە ، کەس ناتوانێ هەژاری بکات ، وە یان دەوڵەمەندی بکات ،وە

---

(٤٦) لێرەدا گرنگی خاڵی دووەهەم دەرئەکـــەوێت کــە بەپێی یاسا ماوە نادرێت کەس زیادە ڕۆیی بکات ·

یان ستەمی لێبکات . وە کەس بەشی کەس ناخوات : **(ان الله یرزق من یشاء بغیر حساب)** بەڵام لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە ، مرۆڤ دەستەو ئەژنۆ دابنیشێو چاوەڕێ بکات لە ئاسمانەوە بۆی ببارێ ، بەڵکو ئەبێ چەند لە توانایا هەیە تێ بکۆشی بۆ بە دەست هێنانی دەرامەتو ژیانی ، چونکە خوای گەورە بە شێوەیەکی **(سیحری)** دەست ناخاتە ژیانی خەڵکییەوە ، هەر وەکو فەرموویەتی : **(ان الله لا یغیر ما بقوم حتی یغیروا ما بانفسهم)** واتە : خوا باری ژیانی گەلێك ناگۆڕێت تا خۆیان نەگۆڕنو خۆیان چاك نەکەن .

**٢ - برایەتی :**

ئیسلام لە سەرەتای سەرهەڵدانییەوە بانگی برایەتی دا بە گوێی موسڵمانانندا ، هاواری بەرز کردەوە ، کە هەموو مرۆڤایەتی برای یەکترن . پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی : (هەمووتان لە ئادەمن ، ئادەمیش لە گڵە) هیچ جیاوازییەکی ڕەگەزایەتیو چینایەتیو تایەفەگەریو ڕەشو سپیو ... هتد .. نییە لە نێوانیاندا ، وە لە بریتی ئەمانە ، برایەتی هێنایە کایەوە ، کە جێگای هەموویانی گرتەوە .خوای گەورە فەرموویەتی : **(یا ایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی وجعلناکم شعوباًوقبائل لتعارفوا اناکرمکم عند الله اتقاکم)الحجرات/١٣**

واتە : ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروست کردووە ، وە کردومانن بە چەند گەلو هۆزێکەوە بۆ ئەوەی یەکتری بناسنو یەکبن .. باشترینتان لای خوا موسڵمان ترینتانە . هەروەها فەرموویەتی :

**(انما المؤمنون اخوة) الحجرات/١٠** واتە خاوەن باوەڕەکان بران .

ئەم بانگەوازە بێ وێنەیە هەموو جیهانی لەرزاندەوە ، هەموو جیاوازی گەرییە ناڕەواکانی دایە دواوەو هەڵی وەشاندنەوە کە لەو سەر دەمەدا باڵیان کێشابوو بە سەر کۆمەڵگاکانی ئەو سەردەمەدا .

له کاتێکا ئەم بانگی برایەتی‌یەی دا بە گوێیاندا،پێی ڕاگەیاندن کە برایەتی بە هەموو واتای وشە بەکار ئەهێنرێت ، واتە چۆن برایەك دڵی ئەسووتێ بۆ برا دایكو باوکیەکەی خۆیو هەمیشە لە هەموو خۆشیو ناخۆشی‌یەکدا بەشداریەتی وە خۆی بە هاوبەش ئەزانێ ، دەستی یارمەتیو کۆمەکی بۆ درێژ ئەکات ، هەر بەو شێوەیە هەموو موسڵمانان برای یەکترن ، وە ئەبێ بە چاوی برایەتی سەیری یەکتر بکەن ، وە بە هاواری یەکترەوە بچنو لە خۆشیو ناخۆشیدا کۆمەك بە یەکتری بکەن،وەکو پێغەمبەر(د٠خ)فەرموویەتی: (کەستان باوەڕی نابێت تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت) ٠

هەروەها فەرموویەتی : (باوەڕی نیيە ئەوەی خۆی تێر بێتو براکەشی برسی) ٠ واتە ئەبێ چاوی لە دراوسێکانی بێت ، ماوە نەدات کە برسیو ڕەشو ڕووت بن ٠ وە چەند لە توانایا هەیە (وە یان‌تەنها لە خۆی زیادە) ئەبێ یارمەتیان بدات ٠

مێژووی ئیسلام پڕە لەو جۆرە نمونانە کە ئامادە بوون لە خۆیان ببورن لە پێناوی برا موسڵمانەکانیاندا ٠

عەلی کوری ئەبی تالب (خ) ڕۆژێك خواردنی ئێوارەیان ئامادە کردبوو کە ئێوارە بیخۆن ، وە لەوە زیاتر هیچی تریان نەبوو ، لە دەمەو ئێوارەدا هەژارێك لە دەرگای داو داوای خواردنی لێ‌کردن ، یەکسەر بەبێ دواکەوتن عەلی بە فاتمەی خێزانی وت : هەستە خواردنەکەی ئێوارەمانی بدەرێ ، پاشان خۆیان بە برسێتی سەریان نایەوە ٠ بەڵێ ئەمەیە ڕاستی برایەتیو یارمەتی دانو دڵسووتان بۆ کەسێکی‌تر ، ئەمەشە ڕاستی موسڵمانێتی ٠

٣ ـ یەکسانی :

لە کاتێکا مرۆڤ دڵنیا بوو لەوەی کە بەندەی کەس نییە هی خوای گەورە نەبێت ، وە دڵنیابوو لە کیانو ژیانو ساغیو ناساغیو ،دڵنیابوو لە ناوو و کەرامەتی ، وە دڵنیا بوو لەوەی کـــە هەموو هێزی سەر زەوی ناتوانێ هیچ زیانێکی پێ بگـــەیەنێ بە بێ ڕەزامەندی خوای گـەورە • پێغەمبەر (د•خ) بـە ئیبن عەباسی فەرموو : (ئەی کوڕی عەباس چـەند وتەیەکت پێ ئەڵێم ئاگـــاداریان‌بە : یەکـەم : یاســای خوا بپارێزە خوا ئەت پارێزێ •

دووەەم : هەر داوایەکت بوو تەنها داوا لە خوا بکە • وە بزانە ئەگەر هەموو کۆمەڵ کۆببنەوە لە سەر ئەوەی کە قازانج یا زیانت پێ بگەیەنن ناتوانن جگـە لەوەی کـە خوا بڕیاری داوە ، پێنوس بـەرز بۆتەوەو دەفتەریش وشك) •

هەروەها مرۆڤ کە بۆی دەرکەوت خەڵکی هــەموویان برای ئەون وە یـەکتریان خۆش ئەوێت ، وە کـەس ناتوانێ ستەمی لێ بکات بـە شێوەیەکی ناڕەوا، وە کەس لەو زیاتر نییە چ هەژار بێو چ دەوڵەمەند، چ بە هێزبێو چ بێ هێز ، وە هەروەها دڵنیا بوو کە جیاوازی نییە لە نێوان گەلەکەیی‌و گەلانی تردا ، با ئەو گەلە پێشکەوتوو تریش بێت ، وە یان دەوڵەمەندتر بێت ، وە یان زۆر ترو بـە هێزتر بێت ، بـەڵکو هــەموو گـەلێ ئازادە لـە خاكو نیشتمانی خۆیدا بـە ئـازادی بژیو فەرمانڕەوایی خۆی بکات لە سنووری ڕژێمی ئیسلامدا(٤٧) • ئەو کەسە لە ناخی دڵی‌یەوە هەست بە یەکسانی ئەکات لە گـەڵ خـەڵکی دەورو پشتی خۆیدا ، وە لە گەڵ میللەتانی جیهاندا • وە گەورەیی‌و ڕێز بـۆ

(٤٧) اشتراكية الاسلام/دكتور مصطفى السباعي : ٤٨-٥٩

ئەو کەسەیە زیاتر کردەوەی باش بێتو فەرمانەکانی خـــوای گـــەورە جێبەجێ بکات ·

ئیتر پێویستی بەوە نییە کەسێك ، یان کۆمەڵێك بانگی یەکسانی بدەن بە گوێیدا ، بەڵکو خۆی لە ژیانێکی یەکساندا ئەژی ، وە هەر کاتێ هەستی بە کەمو کورییەك یان ستەمو چەوساندنەوەیەك کرد کە لادان بێت لەو سنوورانەی ئیســـــلام دیاری کـــردووە ، ئەوا دەستەو ئەژنۆ دانانیشێ ، بەڵکو هەڵئەستێو چاکی چالاکیو مەردایەتی ئەکات بە لاداو بۆ سەندنەوەی مافی زەوت کراوی خۆییو گەنەکـەیو گێڕاندنەوەی بۆ سەر شارێگەی ئیسلام · چونکە خوای گەورە سەربەستیو یەکســانی بە هەموو میللەتان بەخشیوە بە بێ جیاوازی· ئیتر کەس بۆی نییە بـە زۆر دەست بگرێت بە سەر کەسێك وە یان میللەتێکـــی تردا بە ناوی ڕەگەز پەرستی وە یان بە هەر ناوێکی ترەوە ·

وە ئەوانەی مل کەچ ئەکەنو بەرگری لە مافی زەوت کراوی خۆیان ناکەن خوای گەورە سزایان ئەدات لـــە جیهـــاندا بە ســـــەر شۆڕییو ملکەچی ، وە لە ڕۆژی قیامەتا بە سزایەکـی توند وەکـــو لە قورئاندا فەرموویەتی : **(الا تنفروا یعذبکم عذاباً الیماً ویستبدل قوماً غیرکـــم) التوبة/٣٩ ·**

واتە : ئەگەر ڕانەپەڕن خوا سزایەکـی توندتان ئـــەداتو ئەتان گۆڕی بە میللەتێکیتر · هەروەها فەرموویەتی : **(ان الذین توفاهـم الملائکة ظالمی انفسهم قالوا فیم کنتم قالوا کنا مستضعفین في الارض قالوا الم تکن ارض الله واسعة فتهاجروا فیها فأولئك مأواهم جهنـــم وساءت مصیرا) النساء/٩٧ ·**

واتە : ئەوانەی قایل ئەبن بە ستەمو ژێر دەستەییو ناچنـە پاڵ برا ئازادەکانیانەوە لە نیشتمانە ئازاد کراوەکەیاندا ، ئەوە ســتەمیان

له خۆیان کردووه ، خوای گەورە سزای توندو تیژیان ئەدات لـــه دوا ڕۆژا؛چونکە کۆچیان نەکردووه ، بۆ ڕزگـار بوونیـــان له ژێر دەستەیی لەبەر هەر هۆیەك بوو بێ ، سەرەڕای فراوانی زەوی خـوا ، خـــوای گەورە پارمەتی ئەوانە ئەدات کە ڕازی نابن بە ژێر دەستەییو مل کەچی وە دەست هەڵناگرن لە مافی خۆیان ، بە ڕێگای ڕاستەقینەی ئیســـلام کە له قورئاندا بڕیاری لە سەر دراوە : **(اذن للذين يقاتلون بانهـــم ظلموا وان الله على نصرهم لقدير) الحج/٣٩** واتە : ڕێگـــا درا بـــه کۆمەڵی موسڵمانان کە بجەنگن دژی دوژمنانیان : چونکـــه کاتی خـۆی موسڵمانانیان دەرکردووه لە سەر ماڵو سامانیان تەنهـــا لەبەر ئەوەی وتوویانـــه **(ربنا الله)** هەروەها فەرموویەتی : **(ونريد ان نمنّ على الذين استضعفوا في الارض ونجعلهم ائمه ونجعلهم الوارثين)القصص/٥**

وتە : ئەمانەوێ منەتو ناز بکەین بە سەر ئەوانەی کە ژێر دەستە بوون ، وە بیان کەینە پێشڕەوو میراتگر لە زەویدا ٠

ئیسلام مافی ئازادیی داوە بە مرۆڤ ، وە نابێ نه خـــۆی بەندەی کەس بێت ، نە نیشتمانو میللەتەکەی ژێر دەستەی میللەتێکی‌تر بێت ، لەو بارەیەوە عومەری کوڕی خەتاب (خ) فەرموویەتی : (کـــەی ئـــەو خەڵکەتان کردۆتە کۆیلە ، خۆ ئەوان بە ئازادی لە دایك بوون!) ٠

٤ ـ هەموومان ئەزانین مرۆڤ هەموویان وەکو یەك نین لە ڕووی ژیریو توانای لەشو تەندروستی‌یەوە ، وە مرۆڤ نییە کە هیچ جـــۆرە کەمو کوڕی‌یەکی نەبێت لە ژیاندا،چونکە تەنها خوای گەورە بێ کـــەمو کوڕی‌یە،مرۆڤ‌شیاوی لە بیرچوونو خراپە کردنو هەژاریو دەوڵەمەندیو نەخۆشیو ساغیو٠٠٠هتد٠٠لەبەر ئەوە هەموویان وەکو یەك لەیەك ئاستدا ناژین ، بەڵکو بەشێك دەوڵەمەندو بەشێك مام ناوەندیو بەشێکیشـــس

هەژار ئەبن ، بە تایبەتی ئەوانەی پەك کەوتەن ، ئەوە گــوزەرانێکـی ناخۆشیان ئەبێت ، چونکە ناتوانن داهات بە دەست بهێنن ٠

بەڵام زۆر بەداخەوە ئەنجامی تێنەگەیشتن لە ئیسـلامو ڕەفتــار نەکردن بە دەستوورەکانی ، وە خراپ تێگەیاندنی خەڵکـی لە لایـەن هەندێك لەو مەلایانەی کە بازرگانی بە ئایینەوە ئەکـەن ، وە خــۆیان کردووە بە نوێنەری ئیسلام ، لەناو کوردەواری خۆماندا ، وە لە هەموو وڵاتە ئیسلامەکانیشدا ، لەم سەردەمەدا وا باوە کە هــەژاریو دەست کورتی نیعمەتی خوایە ، بەخشیوەتی بە بەشێك لــە موسڵمانان ، وە هیچ کەس نابێ دڵگران بێ لەوەی کە هەژارە بەڵکو بە پێچەوانەوە هەژار خۆشەویستی خوایەو بەهرەیەکی گەورەیە لە لایەن خواوە ، وە لە پاشە ڕۆژدا خوا پاداشتی ئەداتــەوە !! بەڵام لە ڕاستیدا ئــەم قسانــە تێنەگەیشتنە لە ئیسلامو ڕژێمی ئابووری ئیسلام ، بەڵکو ئیسلام بەرییە لەو پروپاگەندانەی کە بڵاوبۆتەوە لە ناو موسڵماناندا ٠ چونکـە بــە پێچەوانەوە هەژاری دەردێکی گـەورەی کۆمەڵایەتییە ، لـە ناو کۆمەڵدا بڵاو ئەبێتەوە ، لە ئەنجامی جێبەجێ نەکـــردنی ڕژێمی ئیســـلامو لادان لە فەرمانەکانی خوای گەورە ٠ نەك هەژاری نیعمەتی خوایە ، چونکـــە ئیسلام هەژاریی بە گەورەترین کۆسپ داناوە لە ڕێگای باوەڕ هێنانو موسڵمانێتیدا ٠ هەر وەکو پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی : (لەوانەیە هــەژاری کـــافر بوونی لە گــەڵدا بێت) هەروەهــا پێغەمبەر لە خوای گەورە پاڕاوەتەوە : (خوای گەورە پەنامان بدەی لە کەنەفتیو تەمەڵیو ترسنۆکیو دەست تەنگی ، وە پەنامان بدەی لە هەژاریو کافریو دوو ڕوویی ، وە پەنامان بدەی لە کــەڕیو لاڵیو شێتی) هەروەهــا عومەری کوڕی خەتاب لە نامەکانیدا بۆ فەرمانبەرانی هەرێمە ئیسلامیەکان

داوای لێ کردوون کە (موسڵمانان برسی مەکەن با کافر نەبن) چونکـــە هەژاریو برسێتی دەردێکی وا کاریگەرە ، مرۆڤ بەرەو کـــافربوونیش ئەبات • مرۆڤی برسی لە پێش هەموو شتێکەوە ، بیر لـە تێرکردنـــی سکی ئەکاتەوە ، وە هیچ نرخێ دانانێ بۆ هیچ ڕێبازو دەستوورێکـــــی ژیان •

ئەمە سروشتی مرۆڤەو هیچ کەس ناتوانێ بەرپەرچی ئەو ڕاستی‌یە بداتەوە • لەبەر ئەوە ڕژێمی ئیسلام ئەمەی ڕەچاو کردووەو ، نرخی بۆ هەموو لایەنێکی ژیان داناوە ، هەرگیز ئەوەی لـە یاد نەکردووە کـە پێویستە قەڵاچۆی هەژاری بکرێت ، وە بنەبڕ بکرێت لە ناو کۆمەڵدا • ئینجا کۆمەڵ ئەتوانێ بەرەو ئاسۆیـەکی تری ژیان بڕوات ، وە ڕێگای نەشو نماو پێشکەوتن بگرێتەبەر • لەبەر ئەوە وەکو لە پێشەوە لـە چەند جێگایەکدا دەستمان بۆ ڕاکێشا ، ئیسلام هانی موسڵمانان ئەدات بۆ هاریکاریو یارمەتی دانی یەکتری • وە ئەرکی سەر شانی هـەموو خاوەن سامانەکانە ، هەژارەکان تێر بکەن ، وە نەهێڵن برسی بن • لەو بارەیەوە پێغەمبەر (د•خ) فەرموویەتی : (خوا ئەوەندەی فـەرز کردووە لەسەر خاوەن سامانەکان کە هەژارەکانی پێ تێر بکرێت • وە هەژاری هەژاران بەهۆی دەست بڵاوی دەوڵەمەندەکانەوەیە وە ئەوەش بزانن کە خوای گەورە لە دوا ڕۆژا سزای توندو تیژیان ئەدات)(٤٨) •

واتە پێویستە لە سەر خاوەن سامانەکان ، کۆمەك بـە هەژاران بکەن وە مافی خۆیان بدەنی • خوای گەورە فەرموویەتی : **(وفي اموالهم حق للسائل والمحروم)** •

---

(٤٨) ارکان الاسلام : دکتور عبدالله محمود شحاته : ١٨٩

واتە : لە سامانەکانیاندا مافی سوالکەرو داماوان هەیە ، وە هیچ منەتێکی نییە . وە پێویستە لە سەر دەوڵەمەندەکان کە مافی هەژارەکان بدەنەوە . خوا پاداشتی داناوە بۆ ئەوانەی هەڵئەستن بە بەجێ هێنانی ئەرکی سەرشانی خۆیانو کەمتەرخەمی ناکەن . پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی : (خەڵکی هەموو رۆزی خۆری خوان ، وە خۆشەویست ترینیان لای خوا باشترینیانە بۆ خێنرانەکەی) .

وە هەروەکو لە باسی خەرج کردنی ساماندا باسمان کرد ، خەرج کردن لە رێگای خوادا ئەرکی سەر شانی هەموو موسڵمانێکی خاوەن سامانەو نابێ رەزیلی بکاتو دەست تەنگ بێت . چونکە ئەگەر کۆمەك بە هەژاران نەکاتو برسییان تێرنەکات ، جل دڕاوان نەپۆشێ موسڵمان نییەو باوەڕی بە ئیسلام نییەو ، فەرمانەکانی خوای بەجێ نەهێناوە :

**(ليس البرّ ان تولوا وجوهكم قبل المشرق والمغرب ولكن البرّ من آمن بالله واليوم الاخر والملائكة والكتاب والنبيين وآتى المال على حبه ذوى القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل وفي الرقاب وآقام الصلاة واتى الزكاة)** .

دوهەم : چەسپاندنی یاساو دەستوورەکانی ئیسلام :

وەکو وتمان خەڵکی هەموو وەکو یەك نین لە رووی ژیری ، یا لەشییەوە ، وە هەروەها وەکو یەك نین لە رووی دڵسۆزیو ڕاست گۆیییەوە،وە لە ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیانو هەست بە لێپرسینەوە بەرامبەر بە خۆییو بە کۆمەڵ . لەبەر ئەوە رژێمی ئیسلام تەنها بە پەروەردەکردنی مرۆڤەوە نەوەستاوە لە کارو باری ژیاندا . بەڵکو یاساو دەستووری تایبەتی داناوە بۆ دیاری کردنی سنووری ئیشو کاری هەموو مرۆڤێك لە کۆمەڵدا . وە چۆنیەتی رەفتار کردنی . بەجێ هێنانی ئەرکی

سەرشانیو چاودێری کردنیان بۆ ئەوەی بە باشی پێی هەستنو لانەدەن لە سنووری دیاری کراوو وە بەرگری بکرێت لە خراپەو ئاژاوەو تەنگو چەڵەمە لە ناو کۆمەڵدا ٠

لە ڕووی ئابووریشەوە کە مەبەستی باسەکـــەی ئێمەیە ، ئیسلام بە چەند ڕێگایەك هەوڵ ئەدات هەژاری لە ناو بەرێتو جیاوازی نێوان هەژارو دەوڵەمەند کەم بکاتەوە ، بە شێوەیەك کە ئەو جیاوازییە بەرەو نەمان بەرێت٠وە خەڵکی هەموو بە ژیانێکی بەختیارو تێرو تەسەل بژینو دادگەری باڵ بکێشێ بە سەریانداو ، هەژاریو ترسو لەرز نەمێنـــێ : بۆ ئەم مەبەستەش ئیسلام چەند ڕێگایەك ئەگرێتە بەر ، کە لە خوارەوە ڕوونی ئەکەینەوە !

١ ـ کارکردن
٢ ـ خاوەندارێتیو تۆبالداری گشتی (التكافل العام)
٣ ـ زەکات
٤ ـ دارایی گشتی

**١ ـ کارکردن :**

لە باسەکانی پێشوودا باسمان کرد کە کارکردن تاکە ڕێگایە بۆ خاوەندارێتی تایبەتی ، وە گرنگییەکی زۆری پێ دراوە تا ئەو ڕادەیەی کارکردن بە شێوەیەك ڕێزی لێ گیراوە کە خراوەتە ئاستی خوا پەرستی٠

خوای گەورە فەرموویەتی : **(وآخرون يضربون في الارض يبتغون من فضل الله وآخرون يقاتلون في سبيل الله) المزمل/٢٠** واتە:هەندێکیان لە کارواندان بۆ بازرگانیو کارکردن وە هەندێکیان لە جەنگـــان لـــە ڕێگای خوادا ٠ لێرەدا خوای گەورە خەباتو کارکردنی حەڵاڵی بە یـــەك چاو سەیر کردووە ٠

**(اعملوا فسيرى الله عملكم) التوبة/١٠٤**

واته كار بكەن خوا چاوى لە كارەكانتان ئەبێت ٠

**(انا لا نضيع أجر من احسن عملا) الكهف/٣٠**

واته : ئێمە پاداشتی ئەوانە ون ناكەین كە كرداری چاك ئەنجام ئەدەن ٠

**(أني لا أضيع عمل عامل منكم من ذكر او انثى) آل عمران/١٩٥**

واته : ئێمە ئیشی كەسێك لە ئێوە ون ناكەین چ نێرو چ مێ ٠

وە پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی : ژێر زەمینیش بگەڕێن بە دوای ڕۆزیدا) وە سەدان ئایەتو فەرموودەی تریش ، ئەوە ڕوون ئەكەنەوە كە ئیسلام زۆر گرنگی داوە بە ئیشو كاركردن ٠

كەوابو ئیسلام قایل نییە كەسێك هەبێت لە كۆمەڵدا بتوانێتو كار نەكات ٠ واتە كاركردن دەوری سەرەكی هەیە لە ژیانی مرۆڤدا ، بۆ بە دەست هێنانی ڕۆزیو دەرامەتی ژیانیان ، وە ئەبێ هەر كەسە بە ڕەنجی شانی خۆی بژی ٠ نەك چاوەڕێ بێت لە سەر چاوەیەكی ترەوە دەستی بكەوێت ، لە ڕەنجی كەسێكی تر ٠

جارێكیان عومەری كوری خەتاب چوو بۆ مزگەوت ، سەیری كرد چەند كەسێك لە مزگەوت دانیشتوونو خەریكی نوێژو تەزبێحاتن ، خێرا چووە ژوورەوەو لێی پرسین چی ئەكەن ؟ وتیان : خوا پەرستی ! عومەر هەموویانی كردە دەرەوە لە مزگەوتەكەو وتی : بچن كار بكەن خۆتانو ماڵو خێزانتان بەخێو بكەن ، وە كاتی نوێژ كردنیش وەرن بۆ مزگەوت نوێژەكانتان بكەن ، ئەوە خوا پەرستییە ٠ واتە ئیسلام تەمەڵ

خانەی دانەناوە ، بەڵکو ئەبێ هەر کەسە بە پێی توانای خۆی کار بکاتو ئارەق بڕێژێ ۰

ئەمەو چەندەها ڕووداوی تریش ،ئەوە ڕوون ئەکەنەوە کە دەوڵەت لێپرسراوە بەرامبەر بە مرۆڤ کە کاری بۆ بدۆزێتەوە ،بۆ ئەوەی خۆیوماڵو منداڵی بەخێو بکاتو هاوبەشیش بکات لە بەرهەمی نەتەوەدا ،بۆ ئەوەی گەشە بکاتو بەرەو پێشکەوتن بڕوات ۰

**٢ ــ خاوەندارێتیو ئۆباڵداری گشتی (التكافل العام)**

لە باسی خاوەندارێتیدا وتمـــان ، خاوەندارێتی لــــە ئیسلامدا سروشتێکی تایبەتی هەیە ، وە چۆنیەتی بە دەست هێنانیو پەرەپێدانیو خەرج کردنیشی دیاری کـــراوە ، بە شێوەیەك کە هۆیەکـــی گرنگو کاریگەر بێت بۆ لەناو بردنی هەژاریو هێنانەدی دادگەری کۆمەڵایەتی، وە کـــەم کردنەوەی جیـــاوازی نێوان چینەکـــان ۰ پێغەمبەر (د۰خ) فەرموویەتی : (ئەگەر مرۆڤێ بە برسێتی مایەوە ، سامان هی کەس نییە) لە شی کردنەوەی ئـــەم فەرموودەیەدا دکتـــور علي البارودي لە کتێبی (دروس في الاشتراكية العربية)دا ئەڵێ : تا لــــە کۆمەڵدا یــەك برسی هەبێ ، یان یەك جل دڕاوو ڕووت هەبێ ، مافی خاوەندارێتی بۆ هیـــچ کەسێك ڕەوا نابێت ، وە پێویست نییە ڕێزی لێ بگیــــــرێ ، وە نابی بپارێزرێ ۰ واتە تا ئەو برسییە تێر نەبێت کەس مافی خاوەندارێتـــی نییە)(٤٩) ۰

هەروەها ئیبن حزم لە کتێبی (المحلى جـ١)دا لە بارەی موسڵمانێکەوە کە برسێتی زۆری بۆ ئەهێنێو دراوسێکـەشی ، یان خەڵکـــی دەورو

---

(٤٩) گۆڤاری العربي کوەیتی ژمارە/٢٤٠

بەری ، زیاد لە پێویستی خۆیان خۆراکیان هەیە ، ئەڵی : فـــەرزە لە سەر ئەوانەی کە هەیانە ، برسی‌یەکە تێر بکەن ، برسی‌یەکـــەش بۆی هەیە بجەنگێ لە گەڵیاندا بۆ بە دەست هێنانی خواردنی پێویستی ـ کە لەوان زیادە ـ تا خۆی پێ تێر بکات ، وە ئەگەر نەیاندایەو کوشتیان ، ئەوە خوێنی لە سەر پیاو کوژەکەیە وە ئەبێ خۆینی بدات ، وە ئەگـــەر خاوەن خواردنەکە کوژرا ئەوا بەر نەفرینی خوا ئەکەوێت ، چونکە مافی کەسێکی داگیر کردووەو نەیداوەتێ ، واتە ستەمکارە خـــوای گـەورە فەرموویەتی : (فأن بغت احداهما على الاخرى فقاتلوا التي تبغي حتى تفيء الى امر الله) الحجرات/٩ واتە : ئەگەر یەکێکیان ستەمی لـــەوی تریان کرد بجەنگن لە گەڵ ستەمکارەکەدا ، تا ئەگەڕێتەوە سەر ڕێگـای ڕاست ، کە فەرمانەکانی خوایە ٠

هەر کەسێ دەست بە سەر مافی کەسێکی‌تردا بگرێت‌و نەیداتێ ، واتە ستەمی لەو برایەی کردووە ، کە مافەکەی لای ئەمە ٠

لە لایەکی ترەوە (بیروڕای زانا حەنەفیەکان لەسەر ئەوەیە ،ئەگەر موسڵمانێك لە گوندێك یا لە گەڕەکێکدا ، لە برسا مرد ، هەموو خاوەن سامانەکان لەو شوێنەدا لێ‌پرسراون لە مردنی،وە بە پیاو کوژ دائەنرێن وە ئەبێ خوێنی کوژراوەکە بدەن) کەوابوو هەموو کەسێك لە نیشتمانی ئیسلامدا لێ‌پرسراوە لە بەخێو کردنـــی ماڵ‌و منداڵی ، وە ئەگـــەر لە پێویستی ماڵ‌و منداڵی زیاد بوو ، لێ‌پرسراوە لە بەخێو کردنی خـــزم‌و کەس‌و کاری هەژاری خۆی،هەروەها لێ‌پرسراوە لە چاودێری‌و تێرکردنی دراوسێ هەژارەکانی (وآتوهم من مال الله الذي اتاكـــم) النور/٣٣٠ واتە : لـــەو سامانەیان بەش بدەن کـــە خوا داویەتـــی پێتـــان ٠ (وبالوالدين احساناً وبذى القربى واليتامى والمساكين والجار ذى القربى والجـــار الجنب والصاحب بالجنب وابن السبيل وما ملكت ايمانكـــم)

النساء/٣٦ واتە چاکە بکەن لە گەڵ دایكو باوکتـــان،وە لە گەڵ خزمو هەییوانو ، نەدارانو ، دراوسێی نزیكو دراوسێی دوورو ، هاوڕێو ڕێبوارو کەنیزەکدا .

وە پێغەمبەری مەزن (د.خ) فەرموویەتی : (ئەی ئادەمیزاد ئەگـەر لە خۆت زیاترت بوو بەخشیت بە خەڵکی ئەوا چاکەیە بۆ خۆت ، بەڵام ئەگەر شاردتەوەو بەشی کەست نەدا ، ئەوە بەڵاو نارەحەتی‌یە بۆ خۆت.

ئەوەی کە زیادیشی نەبێ ئەوە لێی ناگیـرێ) هەروەهـــا (د.خ) فەرموویەتی : (هەر کەسێ بەزەیی بە خەڵکـا نەیەتەوە ، خواش بەزەیـی بەودا نایەتەوە) بەو شێوەیە هـــەموو کەسێك لە کۆمەڵی ئیسلامـدا لێ‌پرسراوە لە یارمەتی‌دانی هەژارانو کۆمەك کردن بە خەڵکیو بەشداری کردن لە بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکاندا .

وە نەوەی ئەرکی شەرشانی بەجێ نەهێنێ ئەوە موسڵمانـــی تەواو نییە،خوای گەورە لە دوا ڕۆژداسزایەکی توندی ئەدات وەکو فەرموویەتی **(ان الله یامر بالعـدل والاحســـان وایتاء ذی القربـــی) النحـــل/٩٠** واتە : خوای گەورە فەرمان ئەکات کە دادپەروەربنو یارمەتی خزمـان بدەن . **(انما المؤمنون الذین آمنـــوا بالله ورسوله ثم لـــم یرتابوا وجاهدوا باموالهم وانفســـهم فی سبیل الله اولئك هـــم الصادقـــون)** الحجرات/١٥ واتە : ئەو خاوەن باوەڕانەی کە باوەڕیان هێناوە بـــە خواو پێغەمبەری خوا ، وە هیچ گومان لـــە دڵیاندا نییە وە بە گیـــانو سامانیان تێ ئەکۆشن لە ڕێگای خوادا ، ئەوانەن ڕاست ئەکـــەن لـــە باوەڕەکەیاندا ـ ئەوانەی کە قایلن پڕ بە دڵ خۆیانو سامانیان لە ڕێی خوادا بکەن بە قوربانی ـ .

وە پێغەمبەر (د٠خ) فەرمووبەتی : (هەر کەس باوەڕی بە خـــواو ڕۆژی دوایی هەیە ، با سەر لە کەس‌و کاری بدات‌و چاوی لێیان بێت)٠ هــەروەهــا فەرموویەتـــی : ( هــەر کەس پارەی کۆکـــردەوەو قەرزی قەرزارێکی لێ نەدایەوە ، وە یان لە ڕێگای خوادا خەرجی نەکـرد ئەوە (کەنزە) خوا لە ڕۆژی قیامەتا بەو کەنزە داخی ئەکات) ٠

ڕژێمی ئیسلام تاکە ڕژێمی سەر زەوی‌یە ، کە بەو شێوەیە خەڵکی بەرپرسیار کردووە لە یارمەتی دانی یەکتری‌و ، بەخێو کردنی هەژاران‌و بەرز کردنەوەی ئاستی ژیانیان ، بۆ ئەوەی لە هـــەژاری دەربچن‌و بێنە ڕیزی ئەوانی ترەوە ٠

وە تا ئێستاش لەم سەردەمەدا پاش دەیان ساڵ دوور کەوتنـــەوە لە ڕژێمی ئیسلام ، زۆر لە موسڵمانان هەڵئەستن بە جێبەجێ کردنـــی ئەرکی سەر شانیان ٠ وەکو موسڵمانێك ، بەبێ ئەوەی کـــەس بە زۆر پێیان بکات ئەمەش نیشانەی کـــاریگـــەری ڕژێمی ئیسلامە لـــە دڵی موسڵمانانداً ٠

کەوابوو کۆمـەك کردن بـــە یەکتری لـــە ئیسلامدا نیشانـــەی موسڵمانێتی‌و باوەڕ بە خواو بەجێ هێنانی فەرمان‌و دەستوورەکانیەتی ، وە لە بارەی ئەو کەسانەوە خوای گەورە فەرموویەتی : **(الذين يؤمنون بالغيب ويقيمون الصلاة ومما رزقناهم ينفقون) البقرة/٣** واتە:ئەوانەی باوەڕیان بە نادیارو شاراوە هەیەو نوێژ ئەکەن‌و ، لەو سامانەی داومانە پێیان بەشی خەڵکی لێ ئەدەن ٠

لێرەدا هاوتایی کردووە لە نێوان باوەڕ بە خواو نوێژ کـــردن‌و ، خەرج کردن لە ڕێگای خوادا ، وە هـــەموویان نیشانـــەی موسڵمانـــی ڕاستەقینەن)(٥٠) ،

---

(٥٠) المال والحكم في الاسلام : عبدالقادر عوده : ٣٦

## ٣ ـ زەکـــات

هەر لە سەرەتای میژووەوە ، کۆمەڵانی خەڵکـــی ئەم سەر زەوی‌یە هەمیشە لە بیری ئەوەدا بوون ، کە چۆن وە بە چ ڕێگایەك ، بچن بەگـژ هەژاری‌داو ، چۆن چارە سەری بکـەن وە لە ناوی بـــەرن ، وە لـــەناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی‌دا هەڵی کەنن ۰ لەبەر ئەوە هەموو کار بەدەستانی کۆمەڵانی مرۆڤ هەر یەکـــەیان بـە پێی زانایی‌و ، بیروڕای خـــۆیان ویستویانە چارەسەری ئەم کێشەیە بکەن (هەر چەندە بۆیان نەکراوە) ، هەندێکیان ئەم ڕواڵەتەیان بەرەو قوڵتربوون بردووە) ۰ بەڵام هەر چۆنێ بێت ، نەیانتوانیووە چارەسەری بکەن وە تا کاتی ئەم نوسینەش هەژاری هەر لە پەرە سەندندایە ، وە ئێستا بە سەدان ملیۆن کەس لەم جیهانەدا لە هەژاری‌و برسێتی‌دا ئەژین ، ســـەرەڕای ئـــەم هەموو ســـامان‌و پێشکەوتنەی لە جیهاندا هاتۆتەکایەوە ۰ خۆ ئەگەر دادپەروەری هەبێت لە دابەش کردندا ، تەنها سامانی دوو وڵاتی وەکو ئەمریکا بەشی هەموو جیهان ئەکات ، کە ڕزگاری ببێت لـە برسێتی ۰ وە تەنها ئـــەوەی بۆ مەبەستی سەربازی خەرج ئەکرێت لە جیهـــاندا ئەتوانێ بـە باشترین شێوە هەژاری بنەبڕ بکات لە هەموو جیهاندا ۰

ئایینە ئاسمانیەکان هەمیشە لە هەوڵدابوون کە چارەسەری ئـــەم کێشەیە بکەن ، وە دەستی هەژاران بگرن بەرەو بەرز کردنەوەی ئاستی ژیانیان ۰ بە تایبەتی ئایینی ئیسلام هەوڵی زۆری داوە بۆ ئەم مەبەستە، وە چەندەها ڕێگای تایبەتی داناوە بۆ بەگژا چوونی هەژاری ، وە بـــە تایبەتی زەکات کە پایەیەکی سەرەکی ئایینی ئیسلامە ، وە لە هەمان کاتا ڕێگایەکی گرنگە بۆ لە ناو بردنی هەژاری ۰ بـەم شێوەیـــە ئیســـلام توانیویەتی لە قۆناغێکی مێژوویی‌دا کە هەژاری لـــە گشت جیهـــاندا

تەشەنەی کردبوو ، لە سەردەمی عومەری کوری عەبدول عەزیزا ،ئیسلام توانی بە ڕژێمە دادگەرەکەی خۆی هەژاری بنەبڕ بکاو کەس نەمێنێ لـە ناویاندا ئەوەندە هەژار بێت زەکات وەربگرێ · یەحیای کـوڕی سەعد ئەیگێڕێتەوە ئەڵێ:عومەری کوڕی عەبدول عەزیز ناردمی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی ئەفریقا ، کاتێ کۆم کردەوە گەڕام بە دوای هـەژاراندا کـە زەکاتەکەیان بدەمێ ، کەس نەبوو لێم وەربگرێ ، عومەر خەڵکی هـەموو تێر کردبوو ، ناچار کۆیلەم پێ کڕیو ئازادم کردن(٥١) ·

بەڵام ئێستا لە سەردەمی سەرمایەداریو سۆشیالیسـتی نوێدا ، کە وەکو خۆیان ئەڵێن ، پێشکەوتوو ترین ڕژێمی ئـەم سەردەمـەن ، نەیانتوانیوە چارە سەری ئەم گیرو گرفتە بکەن · وە هـەتا ئەو ئەرکو باجانەی خراوەتە سەر شانی هاووڵاتیان بۆ بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکـان بە تەواوی نادرێت ، چونکە ئەو کەسەی باجەکە ئەدات هیچ هاندەرێکـی ویژدانی ، وە یان باوەڕ بە خواو ڕۆژی زیندوبوونەوە نییە کە پاڵی پێوە بنێ ، وە بە تەواوی باجەکان بداتو هاوبەشی بکات لە بەرژەوەندی‌یـە گشتی‌یەکاندا · بەڵام موسڵمانە خاوەن باوەڕەکانی ئەم سەردەمە ، هەر چەندە ڕژێمی وڵاتەکانیان ئیسلامی نییەو ، کەس نییە داوای زەکاتی لێ بکاتەو کۆی بکاتەوەو دابەشی بکات · بەڵام زۆربەیان خۆیان هەڵئەستن بە ئەنجامدانی ئەم ئەرکەی سەر شانیان ، وە زەکاتـی سامانەکـانیان بە هەژاران ·

زەکات فەرزێکە لە فەرزە سەرەکیو گرنگەکانی ئیسلام ، وە بەبێ زەکات کۆمەڵانی موسڵمانان ناتوانن لـە ژیانێکـی ئیسلامیدا بژین · **(اقیموا الصلاة وآتوا الزکاة) البقرة/٨٣** واتە:نوێژ بکـەنو زەکـات

(٥١) الزکاة : عبدالرزاق نوفل : ٣٦

بدەن - **(فان تابوا واقاموا الصلاة وآتوا الزكـاة فخلوا سبيلهـــم)** واته : ئەگەر تۆبەیان کردوو ، نوێژیان کردوو ، زەکاتیاندا ، وازیان لێ بهێنن • وە پێغەمبەر (د•خ) فەرموویەتی : (فەرمانم پێ کراوە کـــە بجەنگم لە گەڵ خەڵکیدا تا باوەڕ ئەهێنن بە تاکو تەنهایی خواو ، پـە پێغەمبەرایەتی محمد ، وە نوێژ بکەنو زەکات بدەن ئەگـەر ئەمانـــەیان کرد ، ئەوا ئەبێ خوێنو سامانیـــان بپارێزن وە حسابیان لای خـــوای گەورەیە) •

زەکات بریتییە لە ڕێژەیەکی دیاری کراو لەو سامانەی کە خـوا بەخشیویەتی بە خەڵکی ، وە ئەرکی سەرشانی هەموو کەسێکە ، دەری بکات لەو سامانەی بە دەستییەوەیـە ، کاتێ گـــەیشتنە ڕادەی دیاری کراوی خۆی • فەرمانبەرانی تایبەتی لە دەوڵەتی ئیسلامدا هەڵئەسـتن بە دابەش کردنیو خەرج کردنی ، بە ڕێژەیەکی دیاری کراو کە لـــەم ئایەتەدا هاتووە : **(انما الصدقات للفقراء والمساكين والعاملين عليهـا والمؤلفة قلوبهـــم وفي الرقـــاب والغارمين وفي سبيل الله وابن السبيل فريضة من الله والله عليم حكيم) التوبة/٥٨ـ٦٠** •

زەکات پایەیەکی گرنگە لە پێنج پایەکانی ئیسلام،وە لە قورئانـدا لە زیاتر لە ٣٠ ئایەتا ناوی هاتووە ، زۆربەی ئایەتەکاندا شان بەشانی نوێژ هاتووە ، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە وەکو نوێژ گرنگە لە ئیسلامدا •

وە هەر کەسە بەجێی نەهێنێ ئایینی ناتەواوەو موسڵمانی تـەواو نییە •

**(فان تابوا واقاموا الصلاه وآتوا الزكاة فاخوانكم في الدين) التوبـة/١١**

واته : ئەگەر تۆبەیان کردو ، نوێژیان کردو ، زەکـاتیاندا، ئەوا برای ئایینی ئێوەن •

جگە لەو ئایەتو فەرموودانــەی کـــە لەو بارەیەوە هـــاتوون ٠

لە کاتێکا پێغەمبەر(د٠خ)کۆچیدوایی کرد،هەندێ لەوانەی کە بە ڕاستی ئیسلام لە دڵیاندا جێگیر نەبوبو ، دوو دڵ بوون،یاخی بوونو زەکاتیان نەئەدا ، وە وتیان : زەکات بە پێغەمبەر ئەدرا ، کە ئەو کۆچـــی دوایی کرد ، ئیتر پێویست نییە٠ بەڵام ئەبو بەکری سدیق (خ) زۆر بە چالاکانە هەستاو هەڵوێستە مێژوویی‌یە گەورەکەی خۆی نیشانداو فەرمـووی : (بە خوا ئەجەنگم لە گەڵ ئەوانەی کە زەکات لە نوێژ جیا ئەکەنەوە) ٠ واتە زەکات پایەیەکی بناغەیی ڕژێمی ئیسلامە،و مەرجێکە لە مەرجەکانی موسڵمانێتی ٠

کۆکردنەوەی زەکـــات دوو ئەنجامی گرنگـــی هەیە لە ژیانـــی موسڵمانانەدا ؟

١ ـ ئەنجامێکی تایبەتی : پاك کردنەوەی دەرونـــی مرۆڤو زاڵ بوون بە سەر خۆشەویستی سامانو پارە پەرستیو پیسکـــەیی‌دا ، وە پەیدا بوونی پەیوەندی‌یەکی کۆمەڵایەتی پڕ لـــە ڕێزو خۆشەویســـتیو هاوکاری لە نێوان موسڵماناندا (**خذ من اموالهم صدقة تطهرهم وتزكيهم بها**) **التوبة/١٠٣** ٠

واتە : لە سامانەکانیان زەکات وەربگـرە تا دڵ ودەروونیـــان پاك بکاتەوە ٠

٢ ـ ئەنجامێکی گشتی:زەکات هۆیەکی گرنگە لە دابەش کردنو گواستنەوەی سامانو ، دەستاو دەس کردنی بەناو زۆربەی چینەکانـــی کۆمەڵدا ٠ وە هۆیەکە بۆ دروست بوونی داهات بۆ ئەوانـــەی ناتوانن داهات بە دەست بهێنن ٠ وە هۆیەکە بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی ژیانـــی

هەژارانو کەم کردنەوەی جیاوازی چینایەتیو هەوڵدان بۆ نەهێلانـــی ئەو جیاوازی‌یە ٠

کەمی ڕێژەی زەکات هۆیەکی گرنگە بۆ بەشداری کردنـی زۆربەی خەلکیو ئامادە بونیان بۆ زەکات دان بەبێ دواکەوتن ، ئەویش هۆیەکی گرنگە بۆ زۆر بوونی داهاتی زەکات ٠ وە هەمووشیان هەست ئەکـەن کە هەریەکەیان ئەندامێکی بەکەلکی ناو کۆمەڵن ٠

وەکو وتمان زەکات فەرزێکە لە سەر موسڵمانان ،وە پێویستە لـە سەر هەموو موسڵمانێك کە زەکات بدات ، وە هەر کەســێ سەر پێچی بکات سزا ئەدرێت ، لە هەردوو جیهاندا ٠ دەوڵەت لێپرسراوە کە بـە زۆر لە خەلکی وەربگرێ ٠ پێغەمبەر (د٠خ) لەو بارەیەوە فەرموویەتـی : (هەر کەس زەکات بداتو مەبەستی پاداشتی خوا بێت ، پاداشتی خۆی وەرئەگرێ ، وە هەر کـەسێ نەیدات ، دەست ئەگــرین بەسەر نیوەی سامانەکەیدا) ٠

ئیبن حزم فەرموویەتی : (دەربارەی ئەوەی زەکـات نادات ، ئەبێ لێی بسەنرێت ، پێی خۆش بێت یان نا ٠ ئەگەر نەیدا ئەوە یاخـــی‌یە وە ئەگەر درۆی تێدا کرد ، ئەوە لادەرە ، وە ئەگـەر شاردیەوە ، ئەوە کارێکی ناڕەوای کـــردووە ، پێویستە ئامۆژگـــاری بکرێت ، یان لێی بدرێت تا ئاشکرای ئەکـــات ، یان ئەمرێتو بــەر نەفرینـــی خـــوا ئەکەوێت)(٥٢) ٠

کاتێ کە زەکات فەرزە ، ئیتر هیچ منەتێکـی نیيە ، بەلکـــو مافی ڕەوای هەژارانەو خوای گەورە دیاری کردووە ٠ لـەو بارەیەوە پێشەوا

(٥٢) گۆڤاری العربی کوەیتی ژمارە ٢٤٠ـلە المحلی ج١١ ی وەرگرتووە٠

شافیعی فەرموویەتی:(هەژاران مافیان هەیە لە سامانی دەولەمەندەکاندا، تا ئەو ڕادەیەی هەژارو دەولەمەند وەکو هاوبەشی یەکتر وان ، هەژار بۆی هەیە زەکات بە زۆر لەوە بسێنێ کە لە سەریەتی ئەگەر خۆی نەیدا) . ئەمەش بەلگەیە بۆ ئەوەی کە زەکات هیچ منەتێکی نییەو ، وەکو هەندێ کەس خراپ تێی گەیشتوون .

بەلام زەکات هەر چەندە فەرزە لە سەر شانی موسلمانان،پێویستە دەولەت هەستێ بە کۆکردنەوەی وە بە کارهێنانیو دابەش کردنی لە مەبەستە دیاری کراوەکانیدا . نەك هەر کەسە خۆی هەستێو زەکاتەکەی بدات بە هەژارێك ، چونکە هەر چەندە مافی ڕەوای خۆیەتیو ، خوای گەورە بۆی دیاری کردووە ، ئەرکی سە شانی خاوەن سامانەکانیشە کە بیدەن . خوای گەورە فەرموویەتی : **(في اموالهم حق للسائل والمحروم) الذاريات/١٩ .**

بەلام لە گەل ئەوەشا ئیسلام قایل نییە کە ڕاستەوخۆ لە لایەن خەلکییەوە ئەنجام بدرێت ، ئەویش لەبەر دوو هۆی گرنگ :

یەکەمیان : بە شێوەی ڕاستەو خۆ زەکات ناتوانێ ئامانجو مەبەستەکانی بەدی بهێنێ لە کۆمەلدا کە لەناو بردنی هۆکانی هەژاریو بنەبڕ کردنی هەژارییە .

دووهەم : ئاشکرایە هەر کەسێك شتێ وە یان هەر یارمەتیەك لە کەسێکی تر وەربگرێت ،ئەو کەسە هەست بە جۆرێك کەمو کوڕی لە خۆیدا ئەکات.وە ئەو کەسەی زەکاتەکە ئەدا ، لەوانەیە هەستی خۆ بەزل زانینو پیاوەتیو چاکە کردن بیگرێ ، وە منەت بکات بەسەر ئەوانەی

---

(٥٣) اشتراكية الاسلام : ١٢٨.

زەکاتەکەی داونێ ٠ لەبەر ئەوە ئیسلام ماوە نادات ڕاستەوخۆ ئەنجام بدرێت ٠ بەلکو دەزگایەکی تایبەتــی لە دەولەتــا هەلئەستێ بە کۆکردنەوەی زەکات ، وە پێویستە زەکاتی هەر ناوچەیەك لە ناوچەکەی خۆیدا خەرج بکرێت ٠ وە نابێ زەکاتی هیچ ناوچەیەك لە ناو چەیەکیتر خەرج بکرێت ، ئەگەر لە خۆی زیاد نەبێت(٥٤) ٠ وەکو لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابا زەکاتی هــەر هەرێمو ناوچـــەیەك لە جێگای خۆیدا خەرج کراوە ، ئەگەر زیادەیەکــی بووبێ نێراوە بۆ دەزگای ناوەندی کە لە پایتەختی دەولەتا بووە ٠ بۆ خــەرج کردنــی لەو ناوچانەی کە پێویستییان پێیەتی ٠

هەروەها لە سەردەمی عومەری کوری عەبدول عــەزیزا زەکـــاتی شاری (ڕەی) کۆکرایەوە هێنرا بۆ کوفە ، بــەلام عومەر (خ) قایل نەبوو وە گێڕایەوە بۆ ڕەی ، کە بچن لەوێ خەرجی بکەن ٠

بەلام لەم سەر دەمەدا کە دەولەت هەلناسێ بـــە ئەنجامدانــی ، پێویستە هەر کەسە خۆی ـ بۆ ئەوەی موسلمانێتی خۆی بەجێ بهێنێ ـ ئەم فەرزە ئەنجام بدات ، چونکە نابێ وازی لێ بهێنێ ، بـــە بیانووی ئەوەی ، دەولەت بەو ئەرکە هەلناسێ ٠ ئینجا چ خۆی ڕاستەوخۆ بیدات بە هەژارێك ، وە یان کۆمەلێك لە ناو خۆیاندا کۆی بکەنەوەو بیدەن بە هەژارانی ئەو ناوچە بە شێوەیەك کە باشترین سوودی لێ وەربگیرێ ٠ وە شێوەی دووهەمیان باشترو ڕاستترە و سوودی خۆی ئەگەیەنێ ٠

---

(٥٤) بێگومان ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەبێ هەرێمەکانی ولاتی ئیسلام خاوەنی ئۆتۆنۆمی بن ، وە خۆیان کاروباری خۆیان بــەرن بەڕێوە لە چوار چێوەی ولاتی گەورەی ئیسلامدا ٠

# دابەش کردنی زەکات

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا ، زەکات بە پێی ئەم ئایەتە دابەش کراوە :

**(انما الصدقات للفقراء والمساكين والعاملين عليها والمؤلفة قلوبهم وفي الرقاب والغارمين وفي سبيل الله وابن السبيل فريضة من الله) التوبة/٦٠ .**

واتە : کراوە بە هەشت بەشەوە ، وا لە خوارەوە جیایان ئەکەینەوە :

**١ ـ الفقراء :**

هەژاران ، واتە هەر کەسێ کە ئاستی ژیانی نزمتر بێت لە ئاستی ژیانی زۆربەی خەڵکی لە وڵاتا ، وە هەر کەسێك ئەوەندەی نەبێت کە زەکاتی لەسەر بێت .

**٢ ـ المساكين :**

هەندێك ئەڵێن ئەم وشەیە ئەو هەژارانە ئەگرێتەوە کە لە **(فقراء)** هەژارترن ، هەندێکی تریش ئەڵێن **(مساكين)** ئەوانەن کە سواڵ ئەکەن وە **(فقراء)** ئەوانەن کە نیانەو داواش لە کەس ناکەن . هەندێکیش ئەڵێن : **(فقراء)** هەژاری موسڵمان ئەگرێتەوە ، بەڵام **(مساكين)** هەژاری ئایینەیەکانی تر ئەگرێتەوە(٥٥) .

**٣ ـ العاملين عليها :**

ئەو فەرمانبەرانەی هەڵئەستن بە کۆکردنەوەی زەکاتو دابەش کردنی .

**٤ ـ المؤلفة قلوبهم :**

واتە : دڵ ڕاگیر کراوەکان ـ ئەمانە کاتی خۆی ، ئەو پیاوە ناودارو خاوەن دەسەڵاتانە بوون ، کە دەوڵەتی ئیسلام لەبەر بەرژەوەندی

---

(٥٥) النظام المالي في الاسلام/دكتور عبدالخالق النواوي ، ١٠٤

ئیسلام‌و موسڵمانان‌پشکێکیان داونێ بۆ ئەوەی سوودیان لێ وەربگیرێ‌و نەبنە کۆسپ لە ڕێگای ئایینی ئیسلامدا ٠

بەڵام لە سەردەمی ئەبو بەکـری سدیق‌دا لێیان بڕین ، وە وتیـان ئیسلام وا خۆی گرتووە ، ئیتر پێویست نییە بەشی ئەو جۆرە کەسـانە بدرێت ، چونکە ئەوانە ئێستا ناتوانن هیچ کاری بکەن دژی ئیسلام ٠

٥ ـ وفي الرقاب :

ئەم پشکە لەو سەردەمەدا بە کارهێنراوە بۆ ئازاد کردنی کۆیلە ، بە کڕینیان لــە خاوەنەکانیان‌و ئازاد کردنیان ، هــەروەها بۆ بەردانی زیندانیانی موسڵمان لە وڵاتانی تردا ٠

٦ ـ الغارمين :

بۆ ئەوانەی کە وام (قەرز) کۆبۆتەوە لە سەریان ٠ بەم پشـــکە وامەکانیان بۆ ئەدرێتەوە بە مەرجێك ئەو وامە لە ئەنجامی کارێکـــــی ناڕەوادا پەیدا نەبووبێت ٠

٧ ـ في سبيل الله :

لە ڕێگای خوادا : لە بارەی ئەم پشکەوە مامۆستا عبدالرزاق نوفل لە کتێبی (الزکاة)دا نوسیویەتی :

بەکار ئەهێنرێت لە بواری سەربازی‌و بەرگری لــە دەوڵەتی ئیسلام ، وە هەر شتێ سوودی گشتی موسڵمانانی تێدا بێت ٠

ئەم پشکە هەموو پێویستی‌یەکی تێکۆشان لە ڕێگای خوادا ، وە پاراستنی کۆمەڵ‌و پێش خستنی ، وە هەموو کارێکی چاك و یارمەتـــی دانی خەڵکی‌و چاك کردنی باری ژیانیان ئەگرێتەوە(٥٦)٠

---

(٥٦) الزکاة : عبدالرزاق نوفل : ٤٥

## ٨ ـ ابن السبيل :

بۆ ئەوانەی کە دوور ئەکەونەوە لە جێگـای خۆیان دەستیان ئەبڕێ لە ماڵو سامانیان ، وە پارەیان نێ ئەبڕێت ، لەم پشکە یارمەتیان ئەدرێت بۆ ئەوەی بتوانن بگەنەوە جێگای خۆیان ، با ئەو کەسە لە جێگای خۆیدا دەوڵەمەندیش بێت ٠

بەم شێوەیەی سەرەوە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا دابەش کراوە ٠ وە چەند ئاڵو گۆڕێکی تێدا کراوە ، بـە گوێرەی باروو دۆخی گوزەرانی کۆمەڵ ٠ وە لەم سەردەمەشدا، توانای ئەوە هەیە کە دەستکاری بکرێت بەو مەرجەی لە مەبەستی گشتی زەکـات دەر نەچێت ، کە نەهێشتنی هەژاریو بەرز کردنەوەی ئاستی ژیانی هەژارانە ٠ (چونکە کاتی خۆی کە پێغەمبەر (د٠خ) فەرمانبەرانی ئەنارد بۆ کۆکردنەوەو دابەش کردنی زەکات ، فەرمانی پێ ئەکردن کە زەکات لە دەوڵەمەندان بسێنن وە بیدەن بە هەژارەکان) ٠ بۆ نمونە پشکی دڵ ڕاگیرکراوەکان ئەتوانرێ بەکار بهێنرێت بۆ بڵاو کردنەوەی ئیسلام لە جیهانداو ، دژایەتی کردنی خوا نەناسی،هەروەها یارمەتی دانی گەلانی ژێر دەستە، بۆ ڕزگار بوونیان لە زۆرداریو ستەمو چەوساندنەوە ، وە بۆ یارمەتی دانی وڵاتە کەم دەرامەتو هەژارەکان ٠ وە یان پشکی کۆیلە ئازاد کردن ئەتوانرێ لە مەیدانی پەروەردەو زانستا بەکار بهێنرێت بۆ ڕزگار کردنی کۆمەڵ لە نەخوێندەواریو نەزانیو دوا کەوتن ٠

# سەرچاوەکانی زەکات

زەکات لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەر ئەگیرێت ، وە بە رێژەی دیاری کراو :

١ ـ لە کانو سامانە شاردراوەکانی ژێر زەوی لە سەدا (٢٠) ٠

٢ ـ لە کشتوکاڵو میوەهاتا ، بە پێی باری ئاودانو ئەزیەت کێشان رێژەی دانراوە ، وەکو پێغەمبەر (د٠خ) فەرمانی کرد بە مەعاز لە کاتێکا ناردی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی یەمەن فەرمووی : (دەیەك ئەو کشتوکاڵەی بە دەست ئاو ئەدرێت) واتە بەم شێوەیە :

أ ـ لەو زەوی و زارانەی بە ئاوی باران ئەخۆنەوە لە سەدا (١٠) ٠

ب ـ لەو زەویو زارانەی بە هۆی مرۆڤەوە ئاو ئەخۆنەوە لە سەدا (٥) ٠

لە میوەهاتا لەو سەردەمەدا تەنها لە خورماو مێوژ وەرگیراوە ، چونکە میوەکانیتر ، لە دەستی خەلکا ئەوەندە نامێننەوە بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن(٥٧) ٠ لەبەر ئەوە لەم سەردەمەشدا ، ئەتوانرێ لە رووی ئەو دیاری کردنەوەوە ، هەر میوەیەك توانای مانەوەی درێژ خایەنی نەبێت زەکاتی لێ وەرنەگیرێت ٠

٣ ـ لە پارەو سامانی بازرگانیو ئالتونو زیوودا لە سەدا (٥ر٢) ئەویش بە مەرجێ ساڵێکی بە سەردا تێپەڕ ببێت ٠

٤ ـ مەڕو ماڵات لە مەڕو ماڵاتا بەم شێوەی خوارەوە ، ئەوانیش ئەوانەی لە لەوەڕگای سروشتیدا ئەلەوەڕێن ، چونکە ئەگەر دابەستە بێت زەکاتی لەسەر نییە ٠

---

(٥٧) النظام المالی الاسلامی المقارن : ٢٥

أ ـ ڕەشە ولاغ : لە سی سەر مانگا یەك سەری یەك ساڵە ٠

ب ـ مەڕو بزن : لە چل سەر یەك سەری یەك ساڵە ٠

ج ـ حوشتر : لە پێنج سەر یەك سەری یەك ساڵە ٠

**سەر فیترە :**

هەروەها جۆرێکی تر زەکات هەیە کە پێی ئەڵێن زەکاتی (فطر) وە لە کوردەواری خۆماندا بە سەرفیترە ناسراوە ٠ ئەمیش بە بۆنەی دوایی هاتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانو هاتنی چەژنەوە دانراوە بۆ ئەوەی : لەو ڕۆژەدا دەستی یارمەتی بۆ هەژاران درێژ بکرێت بۆ ئەوەی هاوبەشی خەڵکی بکەن لە خۆشی جەژناو ، هەست بە کەمو کوڕی نەکەن ، وە لە باتی ئەوە ، وا هەست بکەن کە لە کۆمەڵێکی دڵنەرمو پڕ لە هاوکاریدا ئەژین ٠ ئیبن عەباس ئەڵێ : پێغەمبەر (د٠خ) سەرفیترەی فەرز کرد بۆ پاك بوونەوەی ڕۆژوگر لە شتی پڕو پوچو قسەی بەتاڵ ، وە بۆ تێر کردنی هەژاران ٠

**٤ ـ دارایی گشتیو گەنجینەی موسلمان :**

زاناکانی دارایی پێناسەی ئەکەن بەو زانستەی کە بایەخ ئەدات بە خەرج کردنە گشتیو دەرامەتە گشتی‌یەکانو ئاراستە کردنیان بۆ هێنانەدی ئامانجە ئابووریو کۆمەڵایەتی‌یەکانی دەوڵەت ٠

لە ڕژێمی سەرمایەداری‌دا مەبەست لە خەرجیە گشتیو دەرامەتە گشتی‌یەکان هەوڵ دانە بۆ هێشتنەوەی ئابووری وڵاتو پیشەسازی‌یەکانو بە چالاکیو ، ڕەوانەدانی سستی ، ئەویش بەکار کردنە سەر ڕەفتاری بەرهەم هێنەکان ، لە ڕێگای سەپاندنی باج ، وە یان لابردنی‌یەوە ، وە یارمەتی دانی پڕۆژە تایبەتی یەکانو پارێزگاریيان ٠ هەروەها لە ڕێگای ئیشو کارە گشتی‌یەکانەوە (پڕۆژە گشتی‌یەکان) ،

وەکو ڕێگاو بانو دروست کردنی پردوو قوتابخانەو خەستەخـانەو کارەباو ۰۰۰ هتد بۆ ئەوەی بێکاران بخرێنە کارەوە ، وە ببنە خاوەنی سەر چاوەیەکی داهات ۔ تا بتوانن پێویستی‌یەکانیان بە دەست بهێنن، لە ڕێگای ئەو داهاتەوە ۔ ئەمـەش ئەبێتـە هۆی پتر بوونی بەرهـەمی پرۆژە بەرهەم هێنەکان بەو شێوەیە باری ئابووری ئەبوژێتەوە ۰

ئیتر ئەم ڕژێمە بایەخ نادات بەو جیاوازی‌یە گەورەیەی لە ئاستی ژیانی دانیشتواندا هەیە ، وە گەورەترین ناکۆکی چینایەتـی دروست بووە هەروەها لە ڕژێمی سۆشیالیسـتی‌دا ، ئامانجـی خەرجی‌یـە گشتی‌یەکانو ۔ دەرامەتە گشتی‌یەکان ، گۆڕینی خاوەنداریتی تایبەتی‌یە بە خاوەنداریتی گشتی ، وە نەهێشتنی جیاوازی لـە نێوان دەولەمەندو هەژاراندا ، یاخود بە واتای خۆیان دروست کردنی کۆمەڵێکی بێچین ۰

بـەڵام لـە ڕژێمی ئیسـلامدا دارایی گشـتی ئـەکرێ بـە سێ بەشـەوە ، وە هەر بەشـە بـە دەست هێنـانو خـەرج کردنی دیاری کراوە ، وە ئەبێ گرنگیان پێ بدرێت ، وە نابێ تێکـەڵ بکرێن وە یەك بودجەیان لێ پێك بێت، وە دەوڵەت خۆی بـە ئارەزووی فەرمانڕەوایان خەرجی بکات بۆ نمونە زەکات کە بەشێکی گرنگیانە ، ئەبێ لەو بواردانەدا خەرج بکرێت کـە لـە ئایەتـە پیرۆزەکەدا دیاری کراوە لـە سـورەتی (التوبە ئایەتی (٦٠)دا ۰

مەبەستی ئیسلام لەم دیاری کردنە ئەوەیە ، نەوەکو دەوڵەت بـە ئارەزوی کاربەدەستان چۆنیان بوێت خەرجی بکەن،وەکو فەرمانڕەوایانی ئەم سەردەمە ۔ خۆیان بوارەکانی خەرج کردن دیاری ئەکەن،وە بەکاری ئەهێنن ، لە پێناوی مانەوەی فەرمانڕەوایی‌یان ۔ وە گەیشتن بە مەبەستە تایبەتی یەکانیان ۰ بە تایبەتی فەرمانڕەوایانی وڵاتانی بە ناو ئیسلامی، کە ملیۆنەها دینار خەرج ئەکەن لە بواری پروپاگەندەو سەربازی‌دا ،وە

ئەیانەوێ بە زۆری هێزو پڕوپاگەندە خۆیان بسەپێنن بە سەر کۆمەڵدا٠

بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی چ لە ناوەوەی وڵاتو چ لـــە دەرەوەی وڵات،بۆ ناساندنی خۆیانو زل کردنی ئەو دەست کەوتانەی بەخشیویانە بە کۆمەڵ ٠ کە ئەمەش زۆربەی لە بواری قسە دەرناچێ ، وە لـە سەدا چلی ناکرێ بە کردەوە ٠ لە کاتێکا زۆربەی خەڵکــی وڵاتەکانیــان سەك هەڵ ئەگوشن لە برساو ، دەمیان بەستووە لـــە ترسا ، چونکـــە نـــە ئەوەندەیان هەیە تێر بخۆن ، وە نە ئەوەندە ئازادییان هەیە بوێرن دەم بکەنەوە !! بەڵام لە ڕژێمی ئیسلامدا ماوەی ئەوە نییە فەرمانڕەوایان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بەکاری بهێنن ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەبێ دەوڵەتی ئیسلام بەرژەوەندی زۆربەی خەڵکی بگرێتە پێش چـــاو بـــە تایبەتی هەژاران ، کە ئیسلام خۆی مافی ئەوانی دیاری کـــردووە ، وە کەس بۆی نییە دەست کاری بکـات ، تەنها مەگـــەر ئەو دەستکـاری کردنەش بەرژەوەندی زیاتری هەژارانی تێدابێت ٠

بۆ نمونە زەکات دانراوە بۆ نەهێشتنی هەژاریو ، بەرز کردنەوەی ئاستی ژیانیان ، چونکە مەبەستی سەرەکی ئیسلام هێنانەدی هاوسەنگی کۆمەڵایەتی‌یە ، کە نایەتە دی بە لە ناو بردنی هەژاری نەبێت ٠

واتە لە ئیسلامدا مەبەست لە خەرجی‌یە گشتی‌یەکانو ، دەرامەتە گشتی‌یەکان هێنانەدی دادکەرییو هاوسەنگی کۆمەڵایەتی‌یە٠وە پێویستە هەموو خەرج کردنێك ، وە یان ئاڵو گۆڕێك ، کە لە دارایی گشـتیدا ئەکرێت نە گرنگترین پێویستی خەڵکی‌یەوە دەست پێ بکات ، نەك لـە ئارەزوی فەرمانڕەوایانەوە ! عومەری کوری خەتاب (خ) فەرمووییەتـی : (هەموو موسڵمانێك لەم سامانەدا مافی هەیە ، وە مافی هیچ کەس لـــە کەسێکی‌تر زیاتر نییە مەگـەر کۆیلەیەك ــ کـــە مافی زیاترە بۆ ئازاد کردنی ــ وە منیش وەکو یەکێ لە ئێوە وام) ٠

کەوابو ئیسلام ئەو ڕێگایەی بڕیووە لە کاربەدەستان ەوە بودجەی وڵاتی کردووە بە سێ بەشەوە،هەر بەشە بوارێك وە یان چەند بوارێکی دیاری کردووە بۆ خەرج کردنی ، بە پێی گرنگی و پێویستی کۆمەڵ ۰ بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی دارگەرانە هەموو بەشەکانی کۆمەڵ بەشدار بن، وە لە گرنگترین پێویستییەوە دەست بێ بکات ، لە لەناو بردنی کوێرەوەری و هەژاری و ترس و لەرز لە ناو کۆمەڵدا ، بۆ هێنانەدی کۆمەڵێکی بەختیار ۰

واتە نابێ دەرامەتی بەشێك نە بواری بەشێکی تردا خەرج بکرێت(۵۸) ۰

وە تەنها ئاڵو گۆڕێك لەو ڕووەوە ڕووی دابێ لە مێژووی ئیسلامدا ئەوە بوو لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا ، لە بەشی دەستکەوتی جەنگدا ئەو پشکەی دانرابوو بۆ پێغەمبەر (د۰خ)و کەس و کاری، عومەر هەڵی گرت وە خستیە سەر بەشی یەکەم ، (۵۹) کە بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵ و بەهێز کردنی هێزی چەکدار بوو بۆ پارێزگاری نیشتمانی ئیسلام ۰

**دەرامەتە گشتییەکان (گەنجینەی موسڵمانان)**

دەرامەتە گشتییەکان لە ڕژێمی ئیسلامدا کە گەنجینەی گشتی لێ پێك دێت ، لەم بەشانەی خوارەوە پەیدا ئەبێت :

۱ ــ زەکات : لەمەو پێش بە درێژی لە سەری دواین ، چونکە گرنگترین داهاتەو،تا ڕادەیەك سەر بەخۆیە لە داهاتەکانی تر چ لە ڕووی کۆکردنەوەو چ لە ڕووی خەرج کردنەوە ۰

---

(۵۸) النظام المال الاسلامی المقارن : ۱۰۲ ۰
(۵۹) سەرچاوەی پێشو لاپەرە : ۱۲۰

٢ ـ خاوەنداریتیو سامانەکانی میری ٠

٣ ـ ئەو سامانو خاوەندارێتی‌یە گشتی‌یانەی کە دەوڵەت بەڕێوەیان ئەباتو سەرپەرشتیان ئەکات ٠

٤ ـ باجی خەراج : کەبریتی‌یە لە باجی زەویو زار ٠ یەکەم جار لە سەردەمی عومەری کوری خەتابدا هاتەکایەوە ، خرایە سەر ئەو زەویو زارانەی کە موسڵمانان دەستیان گرت بە سەریا ، بەڵام هێشتیانەوە بە دەست خاوەنەکانیانەوە بەرامبەر بە باجی خەراج ٠

٥ ـ باجی (دەیەك) : بریتی‌یە لەو باجەی ئەخرێتە سەر سامانی بازرگانی ڕۆیشتوو بۆ وڵاتانی دەرەوە ، وە هاتوویش لە وڵاتانی دەرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام ، (٦٠) وە پێیان وتووە (عشور) ٠ لەم سەردەمەدا بە باجی گومرك ناو ئەبرێت ٠

٦ ـ باجی (جزیە) : بریتی‌یە لەو باجەی لەو هاووڵاتیانە ئەسەنرێ کە موسڵمان نینو، لە وڵاتی ئیسلامدا ئەژین٠ بێگومان ئەمانە زەکاتیان لێ ناسەنرێت ، چونکە زەکات (بەندایەتی) موسڵمانانەو تەنها لە سەر موسڵمان فەرزە ٠ بەڵام ئەوەی کە موسڵمان نییەو ، وەکو هاووڵاتیەك هەموو مافێکیان هەیە ، پێویستە ئەرکیشیان بخرێتە سەرشان ٠

لەبەر ئەوە لە بریتی زەکات ، جزیەیان لێ ئەسەنرێت،بۆ بەشداری کردنیان لە بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکانی وڵاتا ٠

٧ ـ دەستکەوتی جەنگ : بریتی‌یە لەو سامانو چەكو شتومەکانەی لە ئەنجامی جەنگدا لە گەڵ دوژمن ، دەست موسڵمانان ئەکەوێت پێنج‌یەکی ئەو دەستکەوتە ئەخرێتە گەنجینەی وڵاتەوە ، بۆ خەرج کردنی

(٦٠) النظام المالي الاسلامي المقارن : ٦٥ ٠

بۆ هەژارانو کەم دەرامەتان ، بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزە : **واعلموا انما غنمتم من شيء فان لله خمسه وللرسول ولذى القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل) الانفال/٤١ ٠**

٨ ــ میراتی : ئەو سامانەی لە دوای کەسێك بەجێ ئەمێنێ پاش مردنی ، وە کەسی لە دوا بەجێ نەماوە بیدرێتێ ، لێرەدا دەوڵەت دەست ئەگرێت بە سەریاو ئەخرێتە گەنجینەی سامانی گشتییەوە ، وەکو پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی : (من خاوەن میراتی ئەو کەسەم کەسی لە دوا بەجێ نامێنێ) ٠

هەروەها ئەو پارەو شتومەکانەی ئەدۆزرێتەوەو خاوەنی نادۆزرێتەوە ، ئەمیش ئەخرێتە گەنجینەوە ٠

٩ ــ هەر باجێکیتر بە پێی بارو دۆخی بەرژەوەندی موسڵمانانو ئایینی ئیسلام پێویست بکات بسەنرێت ، دەوڵەت دەسەڵاتی تەواوی دراوەتێ کە هەستێ بە دیاری کردنیو سەندنی لە هاوڵاتیان بە پێی دەستوری (المصالح المرسلة)(٦١) ٠ کە دەسەڵاتێکی فراوان ئەدات بە دەوڵەت بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری هاووڵاتیان ، لە چوار چێوەی ئامانجەکانی ئیسلامدا٠ بۆ نمونە : دەوڵەت بۆی هەیە هەستێ بە سەندنی ڕێژەیەك لە سامانی دەوڵەمەندەکان وەکو پێشەوا مالك فەرموویەتی : (بە پێی پێویستی گەنجینەی موسڵمانان،بۆ خەرج کردنی لە بەرژەوەندی گشتی هاووڵاتیاندا ، وە پارێزگاری نیشتمانی ئیسلام) ،وە لە پێناوی هێنانە دی هاوسەنگی کۆمەڵایەتیدا ٠

---

(٦١) المصالح المرسلة : ئەو کێشەیەیە کە ئایەتێك یان فەرموودەیەکی لە سەر نییە وە بەڵگەیەکیش نییە لەسەری کە دابنرێت یان لابرێت ٠ لەبەر ئەوە دەوڵەت بۆی هەیە لە سنوری بەرژەوەندی موسڵماناندا بڕیاری لەسەر بدات ٠

# خەرجی‌یە گشتی‌یەکان

ڕژێمی ئیسلام هەروەکو لە هەموو لایەنێکی ژیاندا بۆچونێکی تایبەتی‌و سەربەخۆی هەیە ، لە هەمان کاتا لە چۆنیەتی خەرج کردنی دارایی گشتی‌دا مەبەستو ئامانجو ویستی سەربەخۆو دیاری کراوی هەیە ، کە لە سەرەتای فەرمانڕەوایی ئیسلامدا جێبەجێ کراوە ، وە هەمیشە هەوڵ دراوە بۆ گەیشتن بە ئامانجی دیاری کراو · لەم ڕژێمەدا پەیوەندیەکی پتەو هەیە لە نێوان ڕامیاری دارایی‌و ڕێبازی ئابووری‌دا تا ئەو ڕادەیەی ڕامیاری دارایی دائەنرێت بە بەشێك لە ڕێبازی ئابووری ئیسلام ، چونکە بە شێوەیەك دانراوە کە ئامانجو مەبەستەکانی ئیسلام دابین بکات ·

لەبەر ئەوە ڕامیاری دارایی تەنها بەوەوە ناوەستێ کە کۆمەك بە دەوڵەت بکات ، بە پێدانی خەرجیە گشتی‌یەکان ، بەڵکو هەردوولا هەوڵ ئەدەن بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە :

١ ـ دابین کردنی ژیانی هەموو خەڵکی لە نیشتمانی ئیسلامدا ·

٢ ـ هەوڵ دان بۆ هێنانەدی هاوسەنگی کۆمەڵایەتی لە ڕووی ئاستی ژیانەوە بە شێوەیەك نەداری‌و هەژاری بنەبڕ بکرێت ، بە بەرز کردنەوەی ئاستی ژیانی هەژاران ، وە نەهێڵانی بەفیڕۆدانی سامان بە فرە خەرج کردنی (الاسراف) لە نێو دەوڵەمەندانا ، تا هەردوولا بگەنە ئاستێکی یەکسان ، کە جێگای ناکۆکی چینایەتی تێدا نەمێنێ، ئەگەرچی جیاوازی داهات بمێنێ بە ڕادەیەکی کەم ·

### خەرجیە گشتی‌یەکان ئەکرێن بە سێ بەشەوە

١ ـ دەرامەتی باجی زەوی وزار (خەراج) وە باجی (جزیە)ی سەر بە ئایینەکانی‌تر · وە باجی سامانی بازرگانی (عشور) · ئەمانە

ئاراسته ئەکرێن بۆ بەرژەوەندی گشـــتی کۆمەڵ ، وەکـــو موچـــەی فەرمانبەرانو موچە خۆرانو هێـزی چەکـــدار ، وە دروست کردنـــی پرۆژە گشتی یەکان ، وەکو ڕێگاوبان ، پێویستی یەکـــانی کشتوکاڵ ، زانیاری ، تەندروستی ٠٠٠ هتد ٠

٢ ـ دەرامەتی زەکات کە لە موسڵمانان ئەسەنرێت ، بە پێی ئەم ئایەتە خەرج ئەکرێت : **(انما الصدقات للفقراء والمساكين والعاملين عليها والمؤلفة قلوبهم والغارمين وفي سبيل الله وابن السبيل فريضـــة من الله والله عليم حكيم) التوبة/٦٠**

٣ ـ پێنج یەکی دەستکەوتی جەنگ بە پێی ئـەم ئایەتـە خـەرج ئەکرێت : **(واعلموا انما غنمتم من شيء فان لله خمسه وللرسول ولذي القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل) الانفال/٤١ ٠**

واتە : بزانن ئەوەی لە جەنگدا دەستتان ئەکەوێت پێنج یەکی بۆ خواو پێغەمبەرو خزمانیو هەتیوانو هەژارانو ڕێبوارانە ٠

٤ ـ هەروەها ئەو میراتی یەی لە دوای کەسێك بەجێ ئەمێنێو ، کەس میرات ڕەوای نییە وەری بگرێت ، ئەوە ئەخرێتـــە گەنجینـــەی موسڵمانانەوەو ، بۆ مەبەستە گشتی یەکان خەرج ئەکرێت ٠

وە ئەو پارەو سامانانەی ئەدۆزرێتەوەو خاوەنـــی پـەیدا نابێت ئەویش بە هەمان شێوە ئەخرێتە گەنجینەی موسڵمانانەوە بۆ هـــەمان مەبەستی گشتی ٠

# لێپرسراوێتی
# دەوڵەتی ئیسلام

**پێغەمبەر درودو سەلامی خوای لێ بێت فەرموویەتی : (پێویستی کەسێکم پێ بگەیەنن کە خۆی ناتوانێ پێم بگەیەنێ ٠ هەر کەسێ پێویستی کەسێکی گەیاندە فەرمانڕەواو کار بەدەستان ، کە خۆی ناتوانێ پێیان بگەیەنێ ، خوا نەجاتی ئەدات لە پردی سەر دۆزەخو ئەچێتە بەهەشتەوە ، ئەو ڕۆژەی کە هیچ فریای کەس ناکەوێو قاچ گیر نابێت لە هیچو دەست ناگاتە هیچ شتێ) ٠**

**لێپرسراوێتی دەوڵەت لە ئیسلامدا**

هەموو ئەزانین دەوڵەت بریتی‌یە لە نوێنەرانی گەل ، پاش هەڵبژاردنیان بۆ فەرمانڕەوایی کردنی وڵات،بە پێی دەستورو یاسا(٦٢)٠

دەوڵەتی ئیسلامیش بریتی‌یە لەو کار بەدەستانەی کە هەڵ ئەبژێررێن بۆ فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ئیسلام ، بە پێی دەستوورو یاسای ئیسلام کە قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەرو تێکۆشانی زانایانی ئیسلامە ٠ وە هەر کاتێ لای‌دا لەو دەستورانە پێویستە لەسەر موسڵمانان هەوڵ بدەن بۆ ڕاست کردنەوەیان ، وە یان لابردنو گۆڕینیان ، بە دەوڵەتێکی نوێ ، وەکو پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی : (بۆ خەڵکی نییە گوێ ڕایەڵی کەسێك بن کە لە فەرمانەکانی خوا لای دابێ) ٠ هەروەها ەبو بەکری سدیق فەرموویەتی : (هەتا من گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی

---

(٦٢) ئەمە ئەو فەرمانڕەوایانە ناگرێتەوە کە لە ڕێگای گەردشی (کودەتا)ی سەدبازی‌یەوە دێنە سەر کورسی فەرمانڕەوایی‌و بە ئاگرو ئاسن خۆیان ئەسەپێنن بە سەر میللەتا ٠

خوا بم ئێوەش گوێ ڕایەڵی من بن ، ئەگەر من لامدا ئێوەش گـــوێم بۆ مەگرن) ٠

لێرەدا با چەند نمونەیەك بخەینە پێش چاو بزانین فەرمانڕەوایانی ئیسلام چۆن بوون لە کاتی خۆیدا ٠ ئینجا ئەی خوێنەری خۆشەویست خۆت بەراوردیان بکە لە گەڵ فەرمانڕەوایانی ئەم سەردەمەدا : حوزەیفە ناوێك ئەگێڕێتەوە ئەڵێ : جارێکیان چووم بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب کە دیم ، ماتو مەلول دانیشتووە ٠ پێم وت : ئەوە چیتە ئەی سەرداری موسڵمانان ، وا پەژارە دای گرتووی ؟

وتی : ئەترسم هەڵەیە بکەم ، یان کارێکی ناڕەوا بکەم ، کەســتان ڕێم لێ نەگرێت !!

حوزەیفە وتی : بە خوا ئەگەر دیمان لە ڕاستی لات داوە ، ڕێت لێ ئەگرین و ڕاستت ئەکەینەوە ، ئەگەر بە قسەت نەکردین ، بـــە شمشێر لێت ئەدەین ٠ لێرەدا عومەر زۆر دڵخۆش بوو ، پەژارە بەری دا،وە وتی: سوپاس بۆ خوا کە هاوڕێی داومێ بەرگری لە لادانم بکات(٦٣) ٠

وە یان عومەر فەرموویەتی : (ئەگـــەر ئێسترێك لـــە عێراق پێی هەڵبکەوێت ، لە ڕۆژی قیامەتا من لێپرسراوم بەرامبەر خوا ، کە بۆچی ڕێگام بۆ تەخت نەکردووە ؟!

هەروەها فاتمەی خێزانی عومەری کوڕی عەبدول عەزیز ئەڵێ : جارێکیان چوومە ژوورەوە بۆ لای عومەر ، دیم لـــە سەر بەرماڵەکـــەی دانیشتووە ، دەستی خستۆتە ژێر چەناگەی و چاوی پڕ بووە لە فرمێسك٠ لێم پرسی : ئەوە چیتە ؟ وتی : بێ قەزابێ ئەی فاتمە من لێ پرســراوی

---

(٦٣) عمر نظرە عصریة : نوسینی کۆمەڵێك نوسەری موسڵمان

ئەم میللەتەم ، لەبەر ئەوە ئێستا بیر لە هەزارێك ئەكەمەوە كە برسیەتی، وە نەخۆشێك كە نەخۆشیەكەی زۆری بۆ هێناوە ، وە ڕەش‌و ڕوتێكـــی بێ خانەو لانە ، وە هەتیوی دلشكاو ، وە بێوەژنی تەنها ، غەدر لێكراوی خەفەت‌بار ، غەریبێكی داماو وە پیرێكی فرە خێزان‌و كەم سامـان ، وە تا لەم بابەتانە لە هەموو لایەكی ولآتا ، وە ئەزانم كە خوای گەورە لـە ڕۆژی قیامەتا لە من ئەپرسێتەوە وە پالپشتی ئەوانیش پێغەمبەرە (د.خ)، لە بیری ئەوەدا بووم كە چۆن بتوانم بەرامبەری ڕابوەمستم . ئیتر دلم پڕ بوو و دەستم كردە گریان(٦٤) . ئەوەیە ڕاستی لێپرســراوێتی‌و ، ڕاستی دلسوتان بۆ میللەت ، وە تێكۆشان بۆ چـارەسەر كـــردنی گیروگرفتەكانیان . وە ئەمەش لە ئەنجامی باوەڕ بە خوای گەورەو ڕژێمی ئیسلامەوە هەلقولآوە . ئەمە لە لایەك ، وە لە لایەكی تریشــەوە ڕووداوی یەكەم ئەوە دەر ئەخات كە موسلمانان مافی شۆرش كردن‌و یاخی بوونیان هەیە دژی ئەو دەولەتەی بە پێی دەستورەكانی ئیســلام فەرمانڕەوایـی ناكات . كەوابوو لەبەر ئەوەی دەولەت نوێنەری گەلە ، لە هەلسوڕاندنی كاروباری ژیاندا ، هەر بەو شێوەیە ، دەولەت لێپرسراوە لـە دارایــی‌و سامانی خەلكی ، لە كۆكردنەوەو خەرج كــردنی ، بە شێوەیەك كۆمـەل بەرەو دادگەریی كۆمەلآیەتی بەرێت‌و دووریان بخاتەوە لـە دواكـەوتن‌و نەزانی‌و نەخۆشی‌و ، ڕێگای پێشكەوتن بگرێتە بەر ، لە هەموو بوارەكانی ژیاندا .

واتە دەولەت لە ڕژێمی ئیسلامدا لێپرسراوە لە هاوبەش كردنـــی هەموو خەلكی لە سامان‌و دارایی ولآتا . خوای گـــەورە فەرموویەتی : **(خلق لكم مافی الارض جمیعاً)** واتە : هەرچـــی لە زەویدا هــــەیە بۆ ئێوەمان دروست كردووە هەمووتان . بێ‌گـــومان وشەی هەمووتان

---

(٦٤) مشكلة الفقر وكیف عالجها الاسلام/الدكتور یوسف القرضاوی :

تێکڕای خەلکی ئەگرێتەوە ، بە بێ جیاوازی بۆ ئەوەی هەموو خەلکی بتوانن مافی خۆیان وەربگرن وە کەس بێبەش نەبێت . کاتێ خوای گەورە ئادەمی لە بەهەشتا نیشتەجێ کرد هەموو پێویستی‌یەکانی ژیانی بۆ ئامادەکردبوو ، وەکو لە قورئاندا فەرموویەتی :

**(ان لك الا تجوع فيها ولا تعرى وانك لاتظمؤا ولا تضحى) طه ١١٨ـ١١٩**

واتە : ئەبێ نە برسی بیت ، وە نە ڕووت بیت ، وە نە تینوت ببێت ، وە نە سەرماو گەرما کارت تێبکات .

وە کاتێ باوکە ئادەم لە بەهەشت کرایە دەرەوە ، خوای گەورە ئەو مافانەی لێ نەسەندەوە ، چونکە خوا سزای کەسێك نادات بە بڕینی ڕۆزی‌و پێویستی‌یەکانی . بەلام ئەو مافانەی بەستەوە بە هەول‌و تێکۆشان‌و کار کردنەوە لەسەر زەوی .

بۆ ئەوەی بە کارکردن زەوی ئاوەدان بکرێتەوەو بەندایەتی خوای تێدا بکرێت ، وە ببێتە کێلگەی ڕۆژی قیامەت .

هەروەها پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی : (هەر کەسێ کارێکی ئێمەی گرتە دەست‌و ، خانووی نەبوو ئەبێ خانووی بدرێتێ ، وە ئەگەر ژنی نەبوو ، ئەبێ ژن بهێنێ ، وە ئەگەر ولاغی هاتوو چۆی نەبوو ، ئەبێ بیدرێتێ)

کاتێ پێغەمبەر (د.خ) ئەم فەرمانەی دەکردووە ، بە ناوی دەولەتی ئیسلامەوە دەری کردووە ، وە لێپرسراوێتی دەولەتی دیاری کردووە ، چونکە پێغەمبەر (د.خ) لەو کاتەدا فەرمانڕەوای ئیسلام بووە .

مامۆستا مستەفا سباعی ئەلێ : هەر چەندە ئەم فەرموودەیە فەرمانبەرانی دەولەت ئەگرێتەوە ، بەلام ئەو هۆو پێداویستانەی ئەبێتە هۆی ئەو دەست کەوتانە بۆ فەرمانبەران ـ کە بەدەست هێنانی

پێویستی‌یەکانی ژیانیەتی، بۆ ئەوەی دامەزراو بێت،وە ئەرکی سەرشانی بە شێوەیەکی رێك وپێك بەجێ بهێنێ ـ ئەوە ئەگەیەنێ کە پێویستە ، ئەو پێویستی‌یانە بۆ هەموو کار گەرانی کۆمەڵ ئەنجام بدرێت ، با بە کۆمەکی گەنجینەی گشتی‌یش بێت(٦٦) ٠

تێر کرنی هەژارانو بەرز کردنەوەی ئاستی ژیانیانو ، هێنانەدی هاوسەنگی کۆمەڵایەتی‌و دادگەری ، ئەرکی سەر شانی دەوڵەتی ئیسلامە، وە پێویستە ئەنجامی بدات ، بە پێی تواناو باری ئابووری وڵات ٠

تا ئەو رادەیەی ئەگەر پێویست بوو ، بە زۆر لە دەوڵەمەندەکان بسەنرێت ، وە بدرێت بە نەداران کە نیانەو داماون ، لەو بارەیەوە عومەری کوڕی خەتاب (خ) فەرموویەتی : (ئەگەر لە سەرەتای کارمەوە بە بیرمدا بهاتایە ئەوەی ئەمڕۆ دێت بە بیرمدا،زیادەی ماڵی دەوڵەمەندانم وەرئەگرت‌و دابەشم ئەکرد بە سەر هەژارانی کۆچەراندا ٠

هەروەها عومەر لە گەنجینەی گشتی مانگانەی بڕیووەتەوە بۆ هەژارانو کەفتەکارانو لێ قەوماوان(٦٧) ٠

هەروەها فەرموویەتی : (هەر کاتێ خەڵکی ئەوەندەیان نەبوو بەشیان بکات ، مەگەر ماڵو دارایی‌یان تێکەڵ بکرێت ، ئەو کاتە هەموو دارایی‌یەکەیان تێکەڵ ئەکەم ، تا هەموویان نیوە تێر بکرێن ، چونکە کەس بە نیوە تێری نامرێت ٠ تا کاتێ خوای گەورە دەروو ئەکاتەوە) ٠

وە یان بە کەم کردنەوەی هەلی کارکردن بۆ دەوڵەمەندان ، وە زیاد کردنی هەل بۆ هەژارانو خستنەکاریان ، بۆ بە دەست هێنانی داهات بۆ خۆیان ٠ وەکو عومەر بە (هانی)ی سەرکاری دەشتی ڕەبزەی

---

(٦٦) اشتراكية الاسلام ٠ دكتور مصطفى السباعي ٠
(٦٧) تەفسیری خاڵ/جزمی بیستو هەشتەم ٠ لاپەڕە/٢٩ ٠

وت : ئەی هانی باڵت ڕاخە بۆ خەڵکی ، خۆت بپارێزە لە ستەم لێکراو ، چونکە هاوارو نزای گیرایە · ماوەی کەم ماڵیات بدە با ماڵیاتەکەیان بلەوەڕێنێ ، وە ماوەی ماڵیات زۆرەکانی وەکو کوڕی عەفانو کوڕی عەوف کەم بکەرەوە ، چونکە ئەوان ئەگەر ماڵیاتەکەشیان بفەوتێ ئەگەڕێنەوە بۆ کشتوکاڵو خورماکانیان · بەڵام ئەگەر کەم ماڵیاتی هەژار ماڵیاتەکەی بفەوتێ ، منداڵەکانی ئەهێنێو ئەقیڕێنێ بە سەرما : ئەی سەرداری موسڵمانان ! واتە داوای یارمەتی لە دەوڵەت ئەکات لە کاتی هەژاریدا ، ئایا ئەتوانم گوێیان نەدەمێ ؟! لەوەڕەکە ئاسانترە بۆ من لە ئاڵتونو زیوو ، چونکە زەوی خۆیان بووە وە ئەگەر نەیاندەینێ وا ئەزانن ستەمیان لێ کراوە)(٦٨) ·

(٦٨) الاموال : ٢٩٨_٢٩٩ ژمارة : ٧٤٠

# مافه‌كانی هاووڵاتیان له‌ سه‌ر ده‌وڵه‌ت

پێغه‌مبه‌ر (د٠خ) فه‌رموویه‌تی (پێویستی كه‌سێكم پێ بگه‌یه‌نن كه‌ خۆی ناتوانێ پێم بگه‌یه‌نێ ، هه‌ر كه‌سێ پێویستی كه‌سێكی گه‌یانده‌ فه‌رمانڕه‌واو كاربه‌ده‌ستان كه‌ خۆی ناتوانێ پێیان بگه‌یه‌نێ ، خوا نه‌جاتی ئه‌دات له‌ پردی سه‌ر دۆزه‌خ و ئه‌چێته‌ به‌هه‌شته‌وه‌ ، ئه‌و ڕۆژه‌ی كه‌ هیچ فریای كه‌س ناكه‌وێ و قاچ گیر نابێت له‌ هیچ و ده‌ست ناگاته‌ هیچ شتێ) ٠

هه‌روه‌ها عومه‌ری كوڕی عه‌بدول عه‌زیز داوای كردووه‌ له‌ خه‌ڵكی هه‌موو هه‌رێمه‌ ئیسلامیه‌كان كه‌ گیروگرفت و سته‌مكاری موسڵمانانمان پێ بگه‌یه‌نن وه‌كو له‌ نامه‌كانیا بۆ هاولاتیان نوسیویه‌تی : (هه‌ر كه‌سێ سته‌مكاری‌یه‌كمان بۆ ئاشكرا بكات ، وه‌ یان كارێكمان پێ بگه‌یه‌نێ كه‌ سوودی گشتی موسڵمانان وه‌ یان سوودی موسڵمانێكی تێدا بێت ئێمه‌ به‌خشیشی ئه‌ده‌ینێ له‌ سه‌د دیناره‌وه‌ تا سێ سه‌د دینار به‌گوێره‌ی گه‌وره‌یی كاره‌كه‌ی و دووری هه‌رێمه‌كه‌ی كه‌ لێوه‌ی هاتووه‌ به‌ڵكو خوا مافی كه‌سێكی پێ زیندو بكاته‌وه‌ ، وه‌ یان سته‌مێكی پێ لابرێ یا خود ده‌رگای چاكه‌ی لێوه‌ بكرێته‌وه‌!)(٦٩) ٠

ئیسلام پێویستی‌یه‌ بناغه‌یی‌كانی هه‌موو هاووڵاتیه‌كی دابین كردووه‌ ، وه‌كو خواردن و جل و به‌رگ و خانوو . هه‌روه‌ها هه‌وڵدان بۆ به‌ ده‌ست هێنانی ژن هێنان و به‌شووودان بۆ ئه‌وانه‌ی ئه‌یانه‌وێت (ژنیان نییه‌ ، یان شویان نه‌كردووه‌) هه‌روه‌ها خوێندن و تیماركردنی

---

(٦٩) ملامح الانقلاب الاسلامي في زمن عمر بن عبدالعزيز/دكتور عمادالدين خليل : ١٣٠

دابین کردووە • ئەمانە هەموویان ئەرکی سەرشانی دەولەتی ئیسلامە کە ئەنجامیان بدات(٧٠) •

وەکو لە وتەکانی سەرەوەدا بۆت دەرکەوت ، دەولەت لێپرسراوە لە ئەنجامدانی ئەم پێویستیانەی خوارەوە ، بۆ هەموو هاوولاتیەك لە ولاتی ئیسلامدا :

١ ـ مافی خواردنو خواردنەوەو جلو بەرگو نیشتەجێکردن •

واتە : دەولەت لێپرسراوە لە بەدەست هێنانی ئەو مافانـــە بۆ هەموو هاو ولاتیەك،وە نابێ کەسێك نەبرسیو تینوی بێ ، وە نەڕووتو بێ خانەو لانە بێت •

٢ ـ مافی کارکردن :

دەولەت لێپرسراوە لە ئامادە کردنی کار بۆ هـەموو هاوولاتیانو خستنە کاریان ، بۆ ئەوەی بتوانن ژیانی خۆیانو مالو مندالیان دابین بکەن • وە ئەرکی سەرشانیان بەجێ بهێنن بەرامبەر بە کۆمەل ، وەکو لە باسی خاوەندارێتیدا باسمان کرد • هەروەها پێویستە کەرەسەی کارکردن ئامادە بکات بۆ هەموو کرێکارو کاسب کارێك • لەو بارەیەوە پێشەوا غەزالی لەپەرتوکی (احياء علوم الدين)دا فەرموویەتی:(پێویستە لە سەر دەولەت کەرەسەی کارکردن ئامادە بکات بۆ هەموو کرێکارێك، وە هەروەها کار ئامادە بکات بۆ هەموو بێکارێك)(٧١) •

٣ ـ ئامادە کردنی هۆی هاتو چۆو گواستنەوە بۆ هەموو هاوولاتیان بۆ ئەنجامدانی کاروباری دوور و نزیکانیان •

---

(٧٠) الاسلام ضامن للحاجات الضرورية/عبدالعزيز بدری : ٢٦
(٧١) هەمان سەر چاوەی پێشو : ل : ١٥

٤ ـ مافی خوێندنو تیمارکردن :

خوێندنو تیمارکردن له مافه سروشتیو گرنگەکانی مرۆڤن، کــه پێویسته هەموو کەس بەدەستیان بهێنێ له ژیانیا ، وه ئیسلام بایەخی زۆری پێ داون ، چونکــه بێ ئــەوان ژیانـــی مرۆڤ سەختەو پڕ لــه کوێرەوەرییە . وه به هیچ شێوەیەك پێشکـــەوتن به دەست نایەت • خوای گـــەوره فەرموویەتـــی : **(قل ربی زدنی علماً) طـــه/١١٤** واته : بلێ : ئەی پەروەردگار زانستو زانیاری زیاترم بدەرێ •

هەروەها پێغەمبەری مەزن (د•خ) فەرموویەتی : (هەر کـــەسێ رێگایەکی گرته بەر مەبەستی بەدەست هێنانی زانست بوو ، خـــوای گەوره رێگای به هەشتی بۆ ئاسان ئەکات) وه فەرموویەتـی : (داوای زانست بکەن با له چینیش بێت) ، (فێر بوونی زانست فەرزه له سەر هەموو موسڵمانێك) (بخوێنن له بێشکەوه بۆ گۆڕ) واتـــه : لـــه دایك بوونەوه تا مردن •

ئەم فەرموودانەی سەرەوه ئەوه ئەگەیەنن که خوێندن ئەرکـــی سەر شانی هەموو کەسێکه ، وه پێویسته له سەر هەموو کەسێك کــه بخوێنێ • لەبەر ئەوه ئەرکی سەرشانی دەوڵەته هەموو پێداویســتێکی خوێندن ئاماده بکات بۆ خەڵکی ، بۆ ئەوەی بتوانن ئەو ئەرکـــەی سەر شانیان ئەنجام بدەن • ئەمەش هۆیەکی سەرەکییه بۆ پێشکەوتنی وڵات له هەموو ڕوویەکەوه •

هەروەها تیمار کردنی نەخۆشان ئەرکـــی سەرشان دەوڵەتـــەو پێویسته هەموو جێگاو رێگاو پێداویستێکی بۆ ئاماده بکـــات • لەو بارەیەوه پێغەمبەر (د•خ) فەرمانی داوه ،جێگاو رێگای ئاماده کردووه بۆ تیمارکردنی نەخۆشان ، وه لــه گەنجینەی دەوڵەت خەرجیـەکانی دابین کردووه(٧٢) •

---

(٧٢) هەمان سەر چاوەی پێشو لاپەره : ٢٣

٥ ـ دابین‌و دڵنیا کردنی ژیانی ئەو منداڵانەی خاوەنەکانیـــان ئەمریێ‌و لە دوای بەجێ ئەمێنن ٠ وە دارایی‌و سامانێکی وایان بۆ بەجێ نەماوە کە منداڵەکان بتوانن بەباشی خۆیانی پێ بژیێنن ، تا کــەم‌و کوڕی‌و تەنگانە نەیەتە ڕێگــای ژیانیان‌و ڕەش‌و ڕووت نەبن ٠ لــەو بارەیەوە پێغەمبەر (د٠خ) فەرموویەتی : (هـەر کەسێ سامانـــی بەجێ هێشت بۆ ئەوانەی لە دوای بەجێ ماون ، وە هەر کەسێ هەتیوی بەجێ هێشت پەروەردە کردنیان لە سەر منە) هەروەها (د٠خ) فەرموویەتی : (من لێپرسراوم لەوانەی کەسیان نییەو من کەسیانم) واتە : دەوڵەت لێپرسراوە لێیان ، بەخێو کردن‌و پەروەردە کردنیان ئەرکی سەر شانی دەوڵەتە ٠

٦ ـ زاناکانی ئیسلام ، تەنها خواردن‌و پۆشاک‌و خانەی لانەیان بــە پێویستییە سروشتییەکانی مرۆڤ دانــە ناوە ، بەڵکو لــە مرۆڤدا ئارەزوو و ویستی تریش هــەیە کــە پێویستی بە دەست هێنــان‌و تێر کردن هەیە وەکو ئارەزووی (جنس) کــە سنەتێکـــی خواییە بۆ ئاوەدان کردنەوەی جیهان‌و مانەوەی ئادەمیزاد تا ڕۆژی دیاری کراو ٠ لێرەدا ئیسلام تێر کردنی ئەم ئارەزووەی بە یەکێ لـــە پێویستییـــە سروشتییەکانی مرۆڤ داناوە ٠ نمونەش زۆرە بۆ ئەو مەبەستە وەکو :

جارێکیان پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (د٠خ) وتی : (من ژنێکـــم لە ئەنصاریەکان هێناوە ، پێغەمبەر لێی پرسی لە سەر چـەند مارەت کردووە ؟ وتی : لە سەر چوار (اوقیة) ٠ پێغەمبەر (د٠خ) فەرمووی: لە سەر چوار (اوقیة)؟! وەکو زیوو لەو شاخە بتاشن وایــە٠ئێستـــا نیمانە هیچت بدەینێ ، بەڵام بەڵکو بتنێرین بۆ کاروانێك دەستکەوتت لێی ببێ)(٧٣) ٠

---

(٧٣) مشكلة الفقر وكيف عالجها الاسلام : ١٠٨

لێرەدا ئیسلام پێویستی کردووە لەسەر موسڵمانان ، خاوەن سامانەکانیان کۆمەك بکەن بەو هەژارانەی ئەیانەوێ ژن بهێنن‌و هەژاری ماوەیان نادات • زۆر لە زاناکان ئەڵێن : ئەمە ئەرکی سەر شانی دەوڵەتەو پێویستە ئەنجامی بدات • خوای گەورە فەرموویەتی : **(وانكحوا الايامى منكم والصالحين من عبادكم وامائكم ان يكونوا فقراء يغنهم الله من فضله والله واسع عليم) النور/٣٢** واتە : ژن بهێنن‌و شوو پەیدا بکەن بۆ ئەوانەی کە نیانەو پێویستی‌یان پێیەتی ، وە گوێ نەدەن بە هەژاریان) •

هەروەها ئەبو عوبەید قاسم کوڕی سەلام لە کتێبی (الاموال)دا بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەڵێ : عومەری کوڕی خەتاب ژنی هێنا بۆ عاصی ، یەك مانگ لە دارایی گشتی خەرجی دایە) •

هەروەها لە سەردەمی عومەری کوڕی عەبدول عەزیزدا ، عومەر فەرمانی دابوو هەموو ڕۆژێ جاڕ بدرێت : کوان هەژارەکان ؟ کوان ئەوانەی ژن‌و شوویان نییە ؟ تا کاریان ئەنجام بدەین •

ئەم ڕووداوانە ئەوە ئەگەیەنن کە ئەرکی سەرشانی دەوڵەتە ، ئەم پێویستی‌یەی مرۆڤ ئەنجام بدات ، ئەگەر خۆی نەیتوانی ئەنجامی بدات •

٧ ـ پاراستنی خوێن‌و سامان‌و ناموس :

پێغەمبەر (د•خ) فەرموویەتی : (خوێن‌و سامان‌و ناموسی موسڵمانان لە سەر موسڵمانان حەرامە) • واتە : لێپرسراوە لە پاراستنی گیانی مرۆڤ لە ئازاردان‌و لەناو چوون بە شێوەیەکی ناڕەوا **( ولا تقتلوا النفس التى حرم الله الا بالحق ) الانعام/١٥** واتە : هیچ کەسێك نەکوژن بە ناهەق •

**(يا ايها الذين آمنوا كتب عليكم القصاص في القتلى) البقرة/١٧٨** واته :
ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە سزای پیاو کوژ کوشتنەوەیە ٠

هەروەها دەوڵەت لێپرسراوە لە پاراستنی سامانو دارایی هاووڵاتیان لە داگیر کردنو دزیو ، ڕووت کردنەوەو تاڵان کردن ٠ خوای گەورە فەرموویەتی :**(والسارق والسارقة فاقطعوا ایدیهما)** المائدة/٣٨ واتە : دەستی دز ببڕن ٠

هەروەها دەوڵەت لێپرسراوە لە پاراستنی ئابڕوو ناموسی خەڵکی ، لە ناوو ناتۆرەو تاوان کردن بەرامبەری : **(یاایها الذین آمنوا لا یسخر قوم من قوم عسی ان یکونوا خیراً منهم ولا نساء من نساء عسی ان یکن خیراً منهن ولا تلمزوا انفسکم ولا تنابزوا بالالقاب بئس الاسم الفسوق بعد الایمان ومن لم یتب فاولئك هم الظالمون)** الحجرات/١١ ٠ واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە گاڵتە بە یەکتری مەکەن ، چونکە لەوانەیە ئەوەی گاڵتەی پێ ئەکرێت باشتر بێت ، وە خەوش لە یەکتری مەگرن ، وە ناوو ناتۆرە مەنێن لە یەکتری ٠ زۆر خراپە ناوو ناتۆرە نان لە یەکێ کە باوەڕی هێناوە ، ئەوەی پەشیمان نەبێتەوە ستەمکارە ٠

## ئیسلام ئسان بەشانی پێشکەوتن ئەڕوات

وەکو ئەزانین ئیسلام ڕژێمێکی سەربە خۆو خواییە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی، وە دواین ڕژێمی خواییە بۆ سەر مرۆڤ لەبەر ئەوە بە شێوەیەکی وا تەواو و نەبار هاتۆتە خوارەوە ، کە بتوانێت بگونجێت لە گەڵ ژیاندا بە پێی کاتو شوێنو گەشە کردنی ژیانی کۆمەڵ ٠

ئەم ڕژێمە ئەکرێت بەدوو بەشەوە :

بەشی یەکەم : بریتییە لە بیروباوەڕو سەرستنو ڕەوشت کە

دەستورێكی نەگۆڕو تەواوی دیاری كراویان بۆ دانراوە ، وە ماوەی هیچ ناكۆكیو ئاڵ وگۆڕێكی تێدا نییە ٠

بەشی دووهەم : ڕژێمو ڕێكخستنی كۆمەڵ (الشریعه)

لەم بارەیەوە ڕژێمی ئیسلام تەنها سەرەتا گشتیو هێڵە سەرەكیەكانی دەست نیشان كردووە ، ئەمانیش دەستووری خواییـن، وە ماوەی ئاڵو گۆڕیان تێدا نییە ، وەكو (شوری) ڕاوێژ كردن **(وشاورهم فی الامر)** ٠ وە دابین كردنی لای كەمی پێویستی ژیان بۆ هەژاران (وفي اموالهم حق معلوم للسائل والمحروم)(٧٤) ٠ (ان لك الا تجوع فيها ولا تعرى وانك لاتظموا ولا تضحى) ٠

هەروەها زەكات دانان لە سەر موسڵمانان ، ڕێگە نەدان بە دابڕكردن وە سوو خواردن ، یان گزی كردن لە كڕینو فرۆشتنو كاروباری تری ژیاندا ، ماوە نەدان بە كۆكردنەوەی پارەو هەڵگرتنی بەبێ ئەوەی بخرێتە كارەوە ، بوونی خاوەندارێتی تایبەتی بەڵام بەو مەرجانەی بۆی دیاری كراوە ٠٠٠ هتد ٠

بەڵام درێژەو چۆنیەتی جێبەجێ كردنی ئەو مەبەستانە دیاری نەكراوە ، بەڵكو پێویستە بە پێی گۆڕانی كاتو شوێنو باری ژیانی خەڵكی بگۆڕێت ، وە هەر كۆمەڵە بە پێی هەڵو مەرجی تایبەتی بەرژەوەندی خەڵكی ٠ بەڵام لە سنووری ئەو دەستوورو یاسا گشتییانەدا كە دیاری كراوە بۆیان(٧٥) ٠

هەندێ لە زاناكانی ئیسلام بەم لایەنە ئەڵێن ناوچەی بۆشایی لە ڕژێمی ئیسلامدا ٠ ئەم بۆشاییە نابێت بە كەمو كوڕی بۆ ئیسلام

---

(٧٤) ایدولوجية التشريع الاسلامي/محمد شوقي الفنجري/مجلة العربي عدد/٢٠٦ ٠

(٧٥) هەمان سەر چاوەی پێشو ٠

بەڵکو بە پێچەوانەوە ، لایەنێکی زۆر گرنگی ئەم ڕژێمەیە ، کـە ماوەی داوە بە کۆمەڵ لە سنووری ئـەو دەستوورە گشتی‌یانەدا بکۆشێت بۆی وە نەرمیـەکی وای داوەتێ ، کـە ڕژێمێکی زیندوو بـە توانایـە ، وە ڕژێمێکی هـەتا هەتایی‌یە بۆ مرۆڤایەتی‌یە · چـەند مرۆڤایـەتی پێش بکەوێت وە گەشە بکات ، شان بەشانی ئەڕوات بەبێ هیچ دوا کەوتن‌و کەم‌و کورتیەك ·

تێکۆشانی زانایان‌و شارەزایان بۆ شی کردنەوەی دەستوورەکانی ئیسلام‌و جێ‌بەجێ کردنی ناو ئەبرێت بـە (اجتهاد) · پێغەمبەر (د·خ) زۆر گرنگی پێ‌داوە ، فەرموویەتی : (ئەوەی اجتهاد) بکات وە مەبەست بپێکێ ، واتە بە تەواوی مەبـەستی ئیسلامی ڕوون کردبێتەوە ــ ئەوە دوو چاکـەی بۆ ئـەنوسرێت لای خوای گـەورە ، وە ئـەوەی (اجتهاد) بکات‌وە مەبەست نەپێکێ ، یەك چاکەی هـەر بۆ ئەنوسرێت) بێ گومان ئەمەش هاندانە بۆ تێکۆشان لەو ڕێگایە دا ·

ئیسلام شێوەیەکی جێ‌بەجێ کردنی دیاری کراوی دانە ناوە کـە کۆمەڵ خۆی پێوە ببەستێت وە لێی دەر نەچێت ، بەڵکو پێویستە بـە پێی کات‌و شوێنی هـەر کۆمەڵێك جێ‌بەجێ بکرێت بەڵام وەکو وتمان بەو مەرجەی لە دەستوورو ڕێبازەکان دەر نەچێت ·

ڕووداوی مێژوویی‌مان زۆرە بۆ ئەم ئاڵو گۆڕانە ، کە لە جێ‌بەجێ کردنی ئیسلامدا ، بە پێی بارو دۆخی کۆمەڵ‌و کات‌و شوێن کراوە بۆ نمونە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابا تۆمار کردنی سەربازانی لە وڵاتە دراوسێکان وەرگرت ، وە جێ‌بەجێی کرد ، لە کاتێکا تۆمار کردن لە سەر دەمی پێغەمبەرو ئەبو بەکرا نەبوو ·

هەروەها دابەش نەکردنی زەوی وزاری میسرو عێراق وشام بەسەر جەنگاوەراندا ، لە کاتێکا لە سەردەمی پێغەمبەردا (د·خ) دابەش کراوە

به سەریاندا ، وە زۆر نمونەی تریش کـە ئەو لایەنە گرنگەی ئیسلامو چۆنیەتی پڕکردنەوەی (ناوچەی بۆشایی) ڕوون ئەکاتەوە · ئەمانـەش ئالو گۆڕێك بوون بە پێی بارو دۆخی ژیانی موسڵمانانو گەشەکردنی لەو سەردەمەدا ·

ئینجا بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی ئـەم لایەنەی ڕژێمی ئیســلام ، بیروڕای هــەندێ لـە زاناکانی ئیسلام ئەخەینـە پێش چاو ، کـە ئـەو بارەیەوە دەریان بڕیوە ، وە بناغەیەکە بۆ جێبـەجێ کردنی ئیسلام : پێشەوا غەزالی فەرموویەتی : (مەبەستەکانی شەرعی ئیسلام پارێزگاری پێنج شتە لە ژیانی خەڵکیدا ئەوانیش : پارێزگاری ئاینیان، پارێزگاری خودیان (نفس) ، پارێزگاری ژیرییان ، پارێزگاری وەچەیان (النسل)، هەروەها پارێزگاری سامانیان · واتە هــەرچی پارێزگاری ئـەو پێنج مەبەستەی سەرەوە بکات ئەوە بەرژەوەندییە ، وە هەرچی ئەوانە لابدات خراپەیەو دوور خستنەوەی بەرژەوەندییە(٧٦) ·

وە پێشەوا شاطبی لەو بارەیـەوە فەرموویـەتی : (ئێمە ئەبینین یاسادانەر [خوا] بەرژەوەندی خەڵکی مەبەستیەتی · یاسا ئاساییەکانی (مدنیو جنائی) نێو گەلان ئەگۆڕێن بـە پێی گۆڕانی خەڵکی ، شتێك قەدەغە ئەکرێت کاتێك بەرژەوەندی تێدا بێت ، بەڵام هەمان شت ڕەوا ئەکرێت ئەگەر بەرژەوەندی تێدا بوو)(٧٧) ·

هەروەها ئیبن تەیمیە فەرموویەتی : (خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووەو کتێبی ڕەوانە کردووە بۆ ئەوەی خەڵکی بەدادگەری بژین ئەویش ئەو دادگەرییەی کە زەویو ئاسمانەکانی لـەسەر ڕاوەستاون،کەوابوو

(٧٦) اشتراكية الاسلام لە ـ المستصفى جـ١ ص: ٢٧٨ وەری گرتووە·
(٧٧) هەمان سەر چاوەی پێشو لە الموافقات ٢ـ٣٠٦ وەری گرتووە ·

هەر کاتێ بەلگەو ڕواڵەتی ڕاستی (حق) دەرکەوت ، وە بەهەر ڕێگایەك، ئەوە شەرعی خواو ئایینو فەرمانو ڕەزامەندیەتی)(٧٨) ٠

کەوابوو بەرژەوەندی کۆمەڵ لە سنووری دادگەریو پارێزگاری ئەو مەبەستو ئامانجانـەی کـە پێشەوایانی سـەرەوە دەریان بڕیووە مەبـەستی سـەرەکی ژرێمی ئیسلامە ، وە دەوڵـەت بۆی هـەیە لـەو سنوورەدا هەرچی بەرژەوەندی کۆمەڵی تێدا بێت بیکات ٠

## دواووته

لە کاتێکا ئەمانەوێ لە ئابووری ئیسلام بکۆڵینەوە ئەبێ ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ڕژێمی ئیسلام ڕژێمێکی گشتی سـەربەخۆیەو هـەموو لایەنەکانی ژیان ئەگرێتەوە ،کۆمەڵایەتیو ئابووریو ڕامیاری٠٠٠ هتد وە ناتوانین پارچە پارچە جێبەجێی بکەین ، بەبێ ئەوەی گرنگی بدەین بە یەکیەتی هەموو بەشەکانی ڕژێمەکە ، چونکە پەیوەندیەکی پتەو هـەیە لە نێوان هەموو بەشەکانی ، وە هەر بەشە کار ئەکاتە سەر بەشەکانی تر ، وە کاری تێ ئەکرێت لە بەشەکانی ترەوە ٠ وە هەر جیاکردنەوەیەك وە یان بەش بەش کردنێك لەم ڕژێمەدا ئەبێتە هۆی لەنگیو سەرنەکەوتن لە هێنانەدی ئامانجو مەبەستەکانی ٠

لەبەر ئەوە کە ئەمانەوێ لە ئابووری بدوێین ، ئەبێ بگەڕێینەوە بۆ بیروڕای گشتی ئیسلام بەرامبەر بە سامانو گەردونو ژیان ٠ وە هەروەها بایەخ بدەین بە کاری هەر بەشەی ئەم ڕژێمە بۆ سەر لایەنی ئابووری ، وە کارو تینی ئابووری بۆ سەر ئەوان ٠

بۆ نمونە ڕامیاری سامان لە ئیسلامدا بەستراوە بـە بیروباوەڕی ئیسلامەوە ، وە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ڕوانگـەی ئیسلام بۆ سامـانو

(٧٨) هەمان سەر چاوەی پێشو لە اعلام الموقعين ٣ـ٥٤٣ وەری گرتووە٠

گەردونو ژیان ٠ دەربارەی سامانو ئـەو ئەرکو پێویستی‌یانەی کـە دیاری کراوە بۆ خاوەن سامان ، چ لە ڕووی پـەیدا کردنو پەرەپێدانو گەشە کردنی سامان ، وە چ لە ڕووی خەرج کردنو کۆکردنەوەیەوە ٠

خوای پەروەردگار خاوەنی سامانو گـەردونو ژیانە ، وە مرۆڤ وەکیلو جێگرە ، وە پێویستە بە فەرمانو قسەی خاوەنی بجولێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێ بە شێوەیەکی ڕاستو ڕەوا بـە پێی ڕامیاری ئیسـلام بجولێتەوە ٠ چونکە مرۆڤ لە دوا ڕۆژا لێپرسراوە بەرامبەر بە خوا ، لەو سامانەی کە پێی سپێراوە ٠

هەروەها پەیوەندی نێوان ئابووری‌و یاسای (جنائی) لە ئیسلامدا پەیوەندیەکی پتەوە لـە کاتێکا (بڕینی دەستی دز)ی بەستووە بە ژیانی ئابووری‌یەوە لەوانەیە کەسێك بلێت ئەم سزایە سەختـە ، بێ‌گومـان ئەگەر لە ڕژێمێکی وەکو سەرمایەداری‌دا بێت سزایەکی سەختە ٠ بەڵام لە ڕژێمی ئیسلامدا وا نییە چونکە ئیسلام هـەموو کاروبارێکی ژیانی گرتۆتە ئەستۆ ، وە هەموو پێداویستێکی بۆ ئامادە کردووە ، ئیتر هیچ ماوەی ئەوە نەماوە کەسێك هەستێ‌و دزی بکات ٠ خۆ ئەگەر دزی ڕوو بدات ئەوە دەردێکی گرانی کۆمەڵایەتی‌یە ، وە پێویستی بە گەورەترین بەگژا چوون هەیە ٠ با ئەوەش بزانین عومەری کوری خەتاب لە سـاڵی (ڕەمادە)دا بڕینی دەستی دزی هەلگرت ، چونکە ئـەو سـاڵە گرانی‌و نەبوونی بوو ، وە ئەوەی لە نەبوونیا دزی کردبێ ئەوە ئیسلام دەستی نابڕێت ٠

هەروەها حەرام کردنی سوو ، زۆربـەی ئەوانـەی لـە ئیسلام نەگەیشتوون وە دوای ڕژێمە مرۆڤ کردەکان کـەوتوون بـە کوێرانە ئەڵێن ئەمە نابێ ، حەرام کردنی سوو کۆسپێکی گەورەیە لـە ڕێگای گەشەکردنی باری ئابووری‌دا ٠ ئیتر لایەك ناکەنەوە بەلای ئەوەوە کـە

ئیسلام كه سووی حەرام كردووه پەیوەندی هەیە بە (مضاربە) و زەكاتو
رامن كردنی ژیانی خەڵكی لەلایەن دەوڵەتەوە ، وە بۆ ئەو دەستوورانەی
ئیسلام داینناون بۆ سامانو پەرەپێدانیو، یارمەتی دانی یەكترو وامدان بە
یەكتر.وە ئەوەشیان لە بیر بردووەتەوە كە تا ئێستاش زۆر سەرمایە لای
موسڵمانان لەم سەردەمەدا دانراوەو ناخرێتە بانقەوە لەبەر ئەوەی بە
حەرامی ئەزانن - وە بۆ ئەوەی زیاترت بۆ روون ببێتەوە لــە بارەی
بانقی بێسوو لــە ئیسلامدا بگەڕێرەوە بۆ كتێبی (المدخل الى النظرية
الاقتصادية في المنهج الاسلامي)لە نوسینی دكتور احمد النجار كە بــە
درێژی باسی بانقو تاقی كردنەوەیەكی بانقی بێسوو لــە میسرا كــە
گەورەترین سەركەوتنی بەدەست هێنا لە ساڵەكانی ١٩٦٣ هەتا ١٩٦٧.
بەڵام ماوەیان نەدا كەبەردەوام بێتو دایان خست .

# فەرهەنگی ووشەکان

| کوردی : عەرەبی | کوردی : عەرەبی |
| --- | --- |
| رژێم : نظام | وزە : الطاقة |
| سەرمایەداری : الرأسمالية | بار : الظروف |
| سۆشیالیستی : الاشتراكية | دۆخ : الحالة |
| دادگەری : العدالة | چۆنیەتی : كيفية ، كيفاً |
| نادادگەر : غير عادل | چەندایەتی : كمية ، كماً |
| مامناوەندی : وسط : معتدل | جۆرایەتی : النوعية ، نوعاً |
| بیردۆزە : النظرية | رەشبین : متشائم |
| مارکسایەتی : الماركسية | رێباز : مبدأ |
| گەشەکردن : التطور | کێڵگە : مزرعة |
| پشک : سهم | دوارۆژ : القيامة |
| بۆچوون : التصور | خودی : ذاتي |
| گیروگرفت : المشكلة | روانگە : نظرة |
| دەرونی : النفسي | دەزگا : جهاز |
| بەڵگەنەویست : البديهي | دامەزراو : مؤسسة |
| باوەڕ : ايمان ، عقيدة | دابەشکردن : التوزيع |
| رێباز : مذهب | رژێمی بازار : نظام السوق |
| ڕەوا : مشروع ، حلال | پرۆژەی سەربەست : المشروع الحر |
| پێوەر : مقياس | بەکاربردن : الاستهلاك |
| دانەی ئابووری : العامل الاقتصادي | کار ، ئیشوکار : العمل |
| دانە بەرهەم هێنەکان: عوامل الانتاج | خاوەنداریتی : الملكية |
| مرۆڤایەتی : البشرية | شێوەی بەرهەم هێنان : اسلوب الانتاج |
| ئادەمیتی : انساني | |

| کوردی : عەرەبی | کوردی : عەرەبی |
| --- | --- |
| پەیوەندی دابەش کردن : علاقات التوزیع | بەها : القیمة |
| ناوەند : مرکز | ئامێر : آلة |
| ملەملێ : المنافسة | خواست : الطلب |
| ڕۆزی : الرزق | خستنەڕوو : العرض |
| ڕکێف : سیطرة | پەرە پێدان : التنمیة |
| ستەم : ظلم | خەرج کردن : الانفاق |
| ستەمکار : ظالم | جێگر : خلیفة |
| داهاتی نەتەوە : الدخل القومي | ئالوگۆڕ : التداول |
| ڕێکخەر : المنظم | سامان : المال ، الثروة |
| سوو : الفائدة ، الربا | میراتی : المیراث |
| زەویانە : الریع | ئابڕوو : الشرف |
| کرێ : أجر ، الاجرة | بژێوی : المعیشة |
| قازانج : الربح | پەژارە : هم ، هموم |
| سەرچاوە بەرهەمهێنەکان : مصادر الانتاج | دابین کردن : تأمین ، ضمان |
| کارگوزاری : الخدمات | دەستکەوت : الغنیمة |
| دابڕکردن : الاحتکار | گزی : الغش |
| هاوسەنگی کۆمەڵایەتی : التوازن الاجتماعي | زایونزم : الصهیونیة |
| دادگەری کۆمەڵایەتی : العدالة الاجتماعیة | زیادە خۆری : الاسراف |
| فەرمانبەرێتی : وظیفة | کان : المنجم |
| ئامراز : أداة | کانزا : المعدن |
| نرخ : السعر | بەندە:کۆیلە : العبد |
|  | کۆمەڵ : المجتمع |
|  | بەرەو : نحو |
|  | شێوە : اسلوب |
|  | خراپ خۆراکی : سوء التغذیة |

## سەرچاوەکانی ئەم باسە :


١ ـ قورئانی پیرۆز

٢ ـ فەرموودەکانی پێغەمبەری مەزن (د٠خ)

٣ ـ تەفسیری قورئان

٤ ـ الاموال : ابو عبيد قاسم بن سلام
تعليق محمد حامد الفقى ٠ مطبعة الحجازى القاهر ١٣٥٣هـ

٥ ـ الخراج : القاضى ابو يوسف يعقوب بن ابراهيم المتوفى ١٨٢هـ
المطبعة السلفية ـ الطبعة الثالثة ـ القاهرة ١٩٧٤م

٦ ـ المدخل الى النظرية الاقتصادية في المنهج الاسلامي: الدكتور احمد النجار
الطبعة الاولى ١٣٩٣هـ ـ ١٩٧٣م ٠ دار الفكر

٧ ـ فقه الزكاة ـ د : يوسف القرضاوى
الطبعة الثالثة ١٩٧٧ مؤسسة الرسالة

٧ ـ مشكلة الفقر وكيف عالجها الاسلام : الدكتور يوسف القرضاوى

٨ ـ اشتراكية الاسلام : الدكتور مصطفى السباعي
الطبعة الثالثة/١٩٦٠ الدار القومية للطباعة والنشر

٩ ـ المال والحكم في الاسلام : الاستاذ عبدالقادر عودة
الطبعة الثانية ١٣٨٣هـ ـ ١٩٦٤م دار النذير ـ بغداد

١٠ـ ملكية الارض في الاسلام : ابو الاعلى المودودى
مكتبة الشباب المسلم ـ دمشق

١١ـ الزكاة : عبدالرزاق نوفل

١٢ـ قراءات في الاقتصاد الاسلامى : الدكتور فاضل الحسب

١٣ـ خطوط رئيسية في الاقتصاد الاسلامى : محمود ابو السعود
الطبعة الاولى ١٩٦٥م ـ ١٣٨٥هـ مطبعة معتوق اخوان ٠ بيروت

١٤ـ الاسلام ضانن للحاجات الاسلامية للانسان : عبدالعزيز البدرى

١٥ـ السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية : ابن تيمية
مراجعة محمد عبدالله السمان
١٦ـ عمر نظرة عصرية : مجموعة من الكتاب
١٧ـ التوزيع ـ توزيعالدخل القوميوالثروة ـ الدكتورمحمد عزيز محمد
١٨ـ النظام المالى الاسلامي المقارن ـ الدكتور بدوى عبداللطيف عوض
المجلس الاعلى للشؤون الاسلامية ج٠م٠ع٠ ١٩٧٢
١٩ـ النظام المالى في الاسلام ـ الدكتور عبداللطيف نواوى
الطبعة الثانية ١٩٧٣ المكتبة العصرية ـ بيروت
٢٠ـ الموجز في الاقتصاد السياسى ـ ل٠م ـ ليونتيف
ترجمة ابو بكر يوسف ١٩٦٧ وزارة الثقافة المصرية
٢١ـ حركة الاسلام ومفكرو الغرب ـ الدكتور محسن عبدالحميد
٢٢ـ مبادىء الاقتصاد الاشتراكي ـ الدكتور عبدالوهاب مطر الداهرى
وزارة التربية والتعليم/١٩٧٠
٢٣ـ الانسان ذلك المجهول : الدكتور الكسيس كاريل
ترجمة شفيق اسعد فريد
وه هەندى كتێب گۆڤارو ڕۆژنامەی تریش ٠

| لاپەڕە | ناوەرۆك |
| --- | --- |

## ئەم کتێبە

١ – سەرەتایەکە بۆ تێگەیشتن لە یاسای ئابووری ئیسلام .

٢ – [illegible] کوردی موسولمان [illegible] کۆمەلایەتی .

٣ – هەلسەنگاندنێکی دادگەرانەیە لە نێوان یاسای ئابووری ئیسلام‌و یاسای سەرمایەداری‌و سۆشیالیستی دا بە کورتی .

٤ – گرنگی‌و قەشەنگی‌و شیاوی ئابووری ئیسلامت تێئەگەیەنێ

نرخی « دینارێك و صەد فلسە »